# هەندێ زانیاری بۆ شیکردنەوەی رستە

**بەشـەکانی رستە ئەمانەن :** ﴿ ناو - جێناو - هاوەڵناو - هاوەڵکار - ئامرازەکان و نیشانەکان - گرێ - چاوگ - کار ﴾

١ ) **ناو :** وشەیەکە بۆ ناونانی کەسێك یان شتێك یان گیانلەبەرێك بەکار دێت .

وەك : ﴿ **لاڤە - ئازاد - مامۆستا - کوڕ - دار - کتێب - باوەڕ - ئاشتی - قوتابی - کۆتر - قەڵەم - کەو - هەولێر ....** ﴾

٢ ) **جێنـاو :** ئەو وشەیە یە کە لە جێی ناوی کەسێك یان شتێك بەکاردێ

أ/ **جێناوی کەسی سەربەخۆ :** ( من - تۆ - ئەو - ئێمە - ئێوە - ئەوان )

ب/ **جێناوی کەسی لکاو :** ك١ ( م - ت - ی - مان - تان - یان ) ك٢ ( م - یت - ∅ - ین - ن - ن ) ك٣ ( م - یت - ات /ێت - ین - ن - ن ) ك٤ ( ە - ن )

جێناوە سەربەخۆیەکان ئەمانەن جێناوی ﴿ کەسی سەربەخۆ - خۆیی - پرس - نادیار - نیشانە - هەیی ﴾

٣ ) **هاوەڵناو :** ئەو وشەیەیە کەلەرستەدا وەسفی ناوێك یا جێناوێك دەکا. دەبێتە ( دیارخەر ) یان ( تەواوکەری کاری ناتەواو )

زۆربەی ئەو وشانەی پێچەوانەیان هەیە هاوەڵناون ﴿ **باش - خراپ - گەرم - سارد - قەڵەو - زیرەك - لاواز ...** ﴾

رەنگەکان هاوەڵناون، بەلام وشەی ( رەنگ ) خۆی ناوە ﴿ **سوور - شین - سپی - سەوز - مۆر - رەش - زەرد ...** ﴾

تامەکان هاوەڵناون، بەلام وشەی ( تام ) خۆی ناوە ﴿ **تاڵ - تیژ - شیرین - سوێر - تفت - ترش ...** ﴾

ژمارەکان هاوەڵناون، بەلام وشەی ( ژمارە ) خۆی ناوە ﴿ **یەك - دوو - چوار - دە - بیست ویەك - هەزار - سێیەم - نیوە ...** ﴾

هاوەڵناوەکان بەگشتی ئەمانەن هاوەڵناوی ﴿ چۆنیەتی - پرس - نادیار - نیشانە - ژمارەیی ﴾

٤ ) **هاوەڵکار :** ئەو وشەیەیە کەلە رستەدا وەسفی کار دەکات لەرووی کات و شوێنی و چۆنیەتی وە هەمیشە تەواوکەری کارە

هاوەڵکاری کاتی : کاتی روودانی کاری رستە دەردەخات ﴿ **ئەمڕۆ - بەیانی - ئێستا - پار - دوێنێ ...** ﴾

هاوەڵکاری شوێنی : شوێنی روودانی کاری رستە دەردەخات ﴿ **لەناوپۆل - لەسەربان - لەژێر - لەبن - لەتەنیشت ...** ﴾

هاوەڵکاری چۆنیەتی : چۆنیەتی روودانی کاری رستە دەردەخات ﴿ **بەپەلە - بەخێرایی - بەجوانی - شێرانە - مەردانە ...** ﴾

هاوەڵکاری چەندی : چەندیەتی روودانی کاری رستە دەردەخات ﴿ **زۆر - کەم - گەلێك - هەندێك - تۆزێك - کۆلێ ...** ﴾

هاوەڵکاری رێکخستن : رێکخستنی روودانی کاری رستە دەردەخات ﴿ **دوو دوو - پۆل پۆل - دەستەدەستە- هێدی هێدی ....** ﴾

٥ ) **ئامراز و نیشانە :** ئەو وشە یان پیتەیە کە لەرستەدا یارمەتی هەندێ وشە دەدەن بۆ هەندێ لایەنی رێزمانی.

ئامرازی پەیوەندی : ﴿ **بۆ - لە - بە - ژ - ژبۆ - بەرەو - تا - ە ...** ﴾

ئامرازی دانە پاڵ : ﴿ **ی - ە** ﴾ لەکرمانجی خواروو ﴿ **ا - ێ - ێت - ێن - ێد** ﴾ کرمانجی ژووروو

ئامرازی لێکدەر : ﴿ **و - چونکە - کە - کو - بەلام - هەتا - ئەگینا - ئینجا ...** ﴾

ئامرازی بانگکردن : ﴿ **ە - ئەی - هۆ - ێ - هەی - ئا - ئادەی - ئۆ - ئەها ....** ﴾

ئامرازی پێناسین : ﴿ **ەکە - ە** ﴾ ئامرازی نەناسراوی : ﴿ **ەك - ێك - ێ** ﴾ نیشانەی کۆ : ﴿ **ان - ات- جات - هات..** ﴾

٦ ) **گرێ :** ئەو دەستەواژەیە کە لەوشەیەك زیاتر پێك دێت بەلام کاری تێدانییە.

گرێی ناوی : ﴿ **قەلای هەولێر - کتێبی رێزمان - مامۆستای کوردی - چرای ژوورەکە ...** ﴾

گرێی هاوەڵناوی : ﴿ **زۆر جوان - گەلێك باش - گەلێك دڵسۆز - زۆر پیاوانە ...** ﴾

گرێی هاوەڵکاری : ﴿ **زۆر بەپەلە - لەناو دارستانەکە - زۆر بەجوانی - لەژێر خانووەکە ...** ﴾

٧ ) **چاوگ :** وشەیەکە لە رستەدا وەکو ناو رەفتار دەکات و هەمیشە دەبێ نیشانەی چاوگی پێوە بێت ( تن- ین- ان- وون- دن )

﴿ **کەوتن - گرتن - کڕین - بڕین - سووتان - کێلان - چوون - بوون - کردن - خوێندنەوە - بانگکردن - هەڵچوون ...** ﴾

٨ ) **کار :** وشەیەکە کردەوەیەك پیشان دەدات و هەموو رستەیەك پێویستە کاری تێدا بێت.

﴿ **هات - چوو - مرد - دەخوات - دەنوسێت - خوێندووە - کڕیبوو - دەخوارد - دەچێت - بوو - دەبێت ....** ﴾

کاوە هات بۆ قوتابخانە . دوێنێ هیـوا م بینی . قەڵای هەولێر کۆنـــــە .
ناوە کارە نا.پ ناوە هاوەڵکاری کاتی ناو ج.لکاو کارە گرێی ناوییە هاوەڵناو کاری ناتەواوە

خوێندن کۆمەڵگە پێش دەخات . ئازاد ی بـرا م نانـــەکــە ی خوارد .
چاوگە ناو کار ناو نا.دانەپاڵ ناو جێناو ناو نا.پێناسین جێناو کار

---

## نـــاو

| ژمارە | ناوەرۆك | ناسین | ڕەگــەز | هـەبـوون | درووستبوون |
|---|---|---|---|---|---|
| تاك | گشتی | ناسراو | نێـــر | بەرجەستە | سادە |
| کۆ | تایبەتی | نەناسراو | مــێ | واتایی | دارێژراو |
| | کۆمەڵ | | بێ لایەن | | لێکدراو |
| | | | دوولایەن | | |

---

**کار لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە :**

١) **کاری ناتەواو** : ئەو کارەیە کەبە تەنها واتا نابەخشێ بەڵکو پێویستی بەتەواوکەر هەیە .

ە ⟵ کاری ناتەواوە بۆ کاتی ڕانەبردووی ئێستا

بوو ⟵ کاری ناتەواوە بۆکاتی ڕابردوو

دەبێت ⟵ کاری ناتەواوە بۆ کاتی ڕانەبردوو

٢) **کاری تەواو** : ئەو کارەیە کە کردەوەیەك نیشان دەدات کە دراوەتە پاڵ کەسێك یان شتێك کە بکەرە و مانا دەبەخشێ .

﴿ چوو - هات - دەگری - نوستبوو - کەوتووە - دەچێت - دەخوات... ﴾ .

---

**کار لەڕووی ڕێژەوە سێ جۆرە :**

١/ **کاری ڕابردوو** : ئەو کارەیە کە ڕوویداوە . وەك ﴿ مرد - خوارد - هاتبوو - دانیشتووە - دەگری - سووتا - چوو ... ﴾

٢/ **کاری ڕانەبردوو** : ئەو کارەیە کە هێشتا ڕووی نەداوە .وەك ﴿ دەگرێت - دەنوسێت - دەخوات - دەچم - دێ کرم ... ﴾

٣/ **کاری داخوازی** : ئەو کارەیە کە کەسی یەکەم داوا لە کەسی دووەم دەکات بۆ ئەنجام دانی کارێك یان ئەنجام نەدانی وەك ﴿ بخوێنە - بنووسن - بکڕە - بخۆ - هەڵبگرن - بانگ بکە... ﴾

---

**کار لەڕووی کاریگەرییەوە دوو جۆرە :**

١/ **کاری تێپەڕ** : ئەو کارەیە کەبەتەنها لەگەڵ (بکەر) واتای تەواو نابەخشێ بەڵکو پێویستی بە (بەرکار) هەیە.
هەموو ئەندامەکانی لەش بەشداری تێدا ناکەن بۆ ئەنجام دانی. جێناوی لکاوی ﴿ مان - تان - یان ﴾ وەردەگرێت.
﴿ خوێند - کڕی - خوارد - دەشوات - دەگرێت - هێنابوو - دەکێڵم... ﴾.

کەیوان وانەکەی خوێند. نەسرین جل دەشوات. جوتیار زەوی دەکێڵێت.

٢/ **کاری تێنەپەڕ** : ئەو کارەیە کەبەتەنها لەگەڵ (بکەر) واتای تەواو دەبەخشێ پێویستی بە (بەرکار) نییە.
هەموو ئەندامەکانی لەش بەشداری تێدا دەکەن بۆ ئەنجام دانی . جێناوی لکاوی ﴿ مان - تان - یان ﴾ وەرناگرێ.
﴿ چوو - مرد - هات - دەفڕێت - دەگەوێت - نووست - دەبارێت ... ﴾

پیاوەکە مرد. کۆترەکە دەفڕێت. منداڵەکە نووست.



# ئەرکی ناو لەرستەدا

١) نیهاد : ئەو ناوە یان جێناوەیە کەتەنها لەگەڵ کاری ناتەواو دێت و هەمیشە وەسف دەکرێ.

کەیوان زیرەکە.

٢) تەواوکەری کاری ناتەواو: ئەوناوە یان جێناو یان ناوەڵناو یان ناوەڵکارەیە کە لەگەڵ کاری ناتەواو دێت وەسفی نیهاد دەکا.

مامۆستاکە کەیوان بوو.

٣) بکەر: ئەوناوە یان جێناوەیە کەتەنیا لەگەڵ کاری تەواودا دێ و کاری رستە ئەنجام دەدات یان کارێکی دەدرێتە پاڵ.

کەیوان هات.

٤) بەرکار: ئەو ناوە یاجێناوەیە کەتەنها لەگەڵ کاری تێپەڕدا دێ وکاری رستەکەی بەسەردا دێت .

کەیوانم بینی.

٥) تەواوکەری بەیارێدە: ئەو ناوە یان جێناوەیە کە لەگەڵ هەموو جۆرە کارێك دێ کاری رستە زیاتر روون دەکاتەوە بەیارمەتی ئامرازی پەیوەندی. کتێبەکەم بۆ کەیوان نارد.

٦) دیارخەری ناو: ئەو ناوە یا جێناو یا هاوەڵناوەیە لەگەڵ هەموو جۆرە کارێك دێت و زۆرجار ئامرازی دانە پاڵی لە پێش دێت.

منداڵی کەیوان مرد

٧) جێگری بکەر: ئەوناوە یان جێناوەیە کەلەگەڵ کاری تەواودا دێت بەلام بکەرەکەی دیار نیە بەرکارە دەبێتە جێگری بکەر

کەیوان کوژرا.

---

**تێبینی:**

لەزمانی کوردیدا لەرستەدا یان کاری ناتەواو هەیە یان کاری تەواو هەیە.

کارە ناتەواوەکان ئەمانەن (ە - بوو - دەبێت) جگە لەم سێ کارە هەرکارێکی تر هەبێ لەرستەدا کاری (تەواوە).

ئەگەر لەرستەدا (کاری ناتەواو) هەبێ ئەوا (نیهاد و تەواوکەری کاری ناتەواو ) هەیە.

ئەگەر لەرستەدا (کاری تەواو) هەبێ ئەوا (بکەر) یان (جێگری بکەر) هەیە.

| نەسرین | زیرەک | ە . |
|---|---|---|
| ناوە | هاوەڵناوە | کاری ناتەواوە |
| تاکە | ت. کاری ناتەواوە | بۆکاتی ئێستا ( تێنە پەڕە) |
| تایبەتییە | | |
| ناسراوە | | |
| نیهادە | | |

| نەسرین | نووست . |
|---|---|
| ناوە | کاری رابردووە |
| تاکە | تێنە پەڕە |
| تایبەتییە | |
| ناسراوە | |
| بکەرە | |

| نەسرین | کوژرا |
|---|---|
| ناوە | کاری رابردووە |
| تاکە | بکەرنادیارە |
| تایبەتیسە | |
| ناسراوە | |
| جێگری بکەرە | |

---

تێبینی : (ی) هەرگیز نابێتە ئامرازی پەیوەندی.

١- (ی) دەبێتە (ئامرازی دانە پاڵ) ئەگەر دووناوی دابووە پاڵ یەکتری یان (ناو و جێناو) یان (ناو و ناوەڵناو) یان( جێناو و ناوەڵناو) ... واتە لەنێوانیان بێ.

دایکی کاوە... کوری تۆ... هاوڕێ ی باش... ئێوە ی دڵسۆز...

ئا.دانە پاڵ

٢- (ی) دەبێتە جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك ،یاخود ئەگەر توانرا جیناوی لکاوی (مان - تان - یان) ی لە جێ دانراو گونجا

(ی + کار ، کار + ی) نانی خوارد . خواردی . نانمان خوارد خواردمان

جێناو جێناو



**لاڤان نان دەخوات .**
ناو ناو کاری رانەبردوو
بکەر بەرکار

**کاردۆ چوو بــۆ قوتابخانە**
ناو کاری ئا.پا ناو
بکەر رابردوو ت.بەیاریدە

**باوکـــی هێرۆ مامۆستا بوو**
ناو ئامرازی ناو ناو کاری ناتەواو
نیهاد دانەپاڵ دیارخەری ناو ت. کاری ناتەواو

**ئازاد ی بــــرا م لە بازار مـیـوە ی کڕی.**
ناو ئا. دا نەپاڵ ناو جێناو ئامرازی ناو ناو جێناو کاری رابردووە، تێپەڕە
بکەر دیارخەری ناو پەیوەندی ت.بەیاریدە بەرکار

| چاوگ | قەدی چاوگ | رەگی کار |
|---|---|---|
| خوێندن | خوێند | دەخوێنم ← خوێن |
| گرتن | گرت | دەگرم ← گر |
| چوون | چوو | دەچم ← چ |
| سووتان | سووتا | دەسووتێم ← سووتێ |
| کڕین | کڕی | دەکڕم ← کڕ |
| هەڵگرتن | هەڵگرت | هەڵدەگرم ← هەڵ گر |
| بانگ دان | بانگ دا | بانگ دەدەم ← بانگ دە |
| دۆزینەوە | دۆزیەوە | دەدۆزمەوە ← دۆزەوە |
| جوون | جوو | دەجووم ← جوو |
| لەناوبردن | لەناوبرد | لەناودەبەم ← لەناوبە |
| دروست کردن | دروست کرد | دروست دەکەم ← دروست کە |
| هاتن | هات | دێــم ← ێ |

ئامادەکردنی : م. عومەر ئەحمەد خدر (٠٧٧٠٤٦٠٦٤٨٠) ئامادەیی ئازادیی کوڕان و ئامادەیی زانیاریی ئەهلی








# جۆرەکانی پاڕستە

**ڕستەی ئاوێتە**: لە دوو ڕستەی سادە یان پتر پێك دێت بەیاریدەی وشەی لێکدەر (ئامرازی لێکدەر یان جێناوی لێکدەر) دەدرێنە پاڵ یەکتر لە (شاڕستەو پاڕستە) پێك دێت.

**شاڕستە**: لە ڕستەی ئاوێتەدا ڕستەیەکی سەربەخۆیە و مانای تەواو دەدات و وشەی لێکدەری لە پێش نایەت.

**پاڕستە**: لە ڕستەی ئاوێتەدا ڕستەیەکی سەربەخۆ نییە واتاکەی بەندە بە شاڕستەوە کاری ناوێك یان جێناوێك یان هاوەڵکارێك دەکات و هەمیشە وشەی لێکدەری لە پێش دێت.

**وشەی لێکدەر**: ئەو وشانەن کە شاڕستەو پاڕستە بە یەکەوە دەبەستنەوە و هەمیشەدەکەونە پێش پاڕستە.
(کە - کو - بەڵکی - چونکە - چونکی - بەشکو..........)

بە کرێکارەکانم گوت (شاڕستە) کە (وشەی لێکدەر) کاری خۆتان بە فیرۆ مەدەن. (پاڕستە)

زەنگەکە لێدرا (پاڕستە) کـە (وشەی لێکدەر) خوێندکارەکان چوونە ژوورەوە. (شاڕستە)

---

لە زمانی کوردیدا سێ جۆر پاڕستە هەیە:

١- **پاڕستەی ناوی**: ئەو ڕستەیە کە سەر بە شاڕستەیە و واتاکەی بەندە بە واتای ئەوەوە دەکرێ ببێتە (جێگری بکەر) یا (بکەر) یان (نیهاد) یان (بەرکار).

**تێبینی**: لە ڕستەی ئاوێتەدا، ئەگەر شاڕستە یەکێك لەمانە (نازانرێ - من نەزانییە - من نەبیستییە - بیستوومە - ئاشکرایە - مەزانییە - زانراوە - دەرنەکەفتییە ...) بوو، ئەوا پاڕستەکە (ناوی) یە

ئەگەر کاری شاڕستەکە کارێکی (بکەرنادیار) بوو، ئەوا پاڕستە ناوییەکە ئەرکی دەبێتە (جێگری بکەر)
**نازانرێ کە ئاسۆ لـەبەر چی دوا کەوت.** پاڕستەی ناوی لێرەدا ئەرکی (جێگری بکەر) ی کاری (نازانرێ) ی پێ سپێراوە.

ئەگەر کاری شاڕستەکە کارێکی (تێنە پەڕ) بوو، ئەوا پاڕستە ناوییەکە ئەرکی دەبێتە (بکەر)، بەمەرجێ بکەر لەشاڕستەکە نەبێت.
**دەرکەوتووە کە کاوە کتێبەکە چاپ دەکات.** پاڕستەی ناوی لێرەدا ئەرکی (بکەر) ی کاری (دەرکەوتووە) ی پێ سپێراوە.

ئەگەر کاری شاڕستەکە کارێکی (ناتەواو) (ە - بوو - دەبێت) بوو، ئەوا پاڕستە ناوییەکە ئەرکی دەبێتە (نیهاد)
**ئاشکرایە کە کورد بەیەکریزی دەگاتە ئامانج.** پاڕستەی ناوی لێرەدا ئەرکی (نیهاد)ە مانای (کاری ناتەواو) ی ڕوونکردووەتەوە.

ئەگەر کاری شاڕستەکە کارێکی (تێپەڕ) بوو، ئەوا پاڕستە ناوییەکە ئەرکی دەبێتە (بەرکار)
**زانیومانە کە مامۆستا نایەتە قوتابخانە.** پاڕستەی ناوی لێرەدا ئەرکی (بەرکار) ی کاری (زانیومانە) ی پێ سپێراوە.

٢- **پاڕستەی هاوەڵناوی**: ئەو ڕستەیە کەسەر بە شاڕستەیە و واتاکەی بە واتای ئەوەوە بەندە وەسفی ناوێك دەکا لە شاڕستەدا.
**پیاوەکەم دیت کە دەشەلی.** پاڕستەی هاوەڵناوی لێرەدا وەسفی ناوێکی ناو شاڕستەکەی کردووە.

٣- **پاڕستەی هاوەڵکاری**: ئەو ڕستەیە کەسەر بە شاڕستەیە و واتاکەی بەندە بە واتای ئەوەوە وەسفی کارێك دەکا لە شاڕستەدا.
**وی دەرمان خوار بەڵکی پێ چێبیت.** پاڕستەی هاوەڵکاری لێرەدا وەسفی کاری شاڕستەی کردووە بۆیە هاوەڵکارییە.

نوسینگەی ماردین
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی هەولێر
07507977770
marden office

## ڕاهێنان (١) لاپەرە ١٠

| ڕستە | پارستە | جۆری پارستە |
|---|---|---|
| ١ | بەلکی ب ئارما نجا خۆ دگەهین | پارستەی هاوەڵکاری |
| ٢ | کە ئاشنا دەبێتە ئەندازیار | پارستەی ناوی |
| ٣ | کو ولات هەر بە زانستێ پێش دکەڤیت | پارستەی ناوی |
| ٤ | کە خوێندمان | پارستەی هاوەڵناوی |
| ٥ | کە بەهار هات | پارستەی هاوەڵکاری |

## ڕاهێنان (٢) لاپەرە ١٠

١) بیستوومە کە ئەلەند دەبێتە ئەندازیار.
نازانرێت کە ئاسۆ لەبەر چی دواکەوت.
بە کرێکارەکانم گوت کە کاتی خۆتان بە فیرۆ مەدەن.

---

٢) ئەو چرایەی کە ڕووناك بوو کوژایەوە.
من شڤان دیت کو ژ ترسان دلەرزی.
پیاوەکەم دیت کە دەشەلی.

---

٣) پیاوەکەم دیت کە بە خێرایی دەڕۆیشت.
کە زەنگەکە لێدرا خوێندکارەکان چوونە ژوورەوە.
وی دەرمان خوار بەلکی پێچێبیت.

---

## ڕاهێنان(٣) لاپەرە ١٠

| ڕستە | پارستە | جۆر | شیکاری |
|---|---|---|---|
| ١ | کەوا غونچە دەپشکووت. | پارستەی هاوەڵکاری | کە : وشەی لێکدەرە.<br>وا : هاوەڵکاری کاتییە ، تەواوکەری کارە.<br>غونچە : ناوە، تاکە ، گشتییە ، نەناسراوە ، بکەرە.<br>دەپشکووت : کاری ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندنە ، تێنە پەرە. |
| ٢ | کە پێشمەرگەکە لەبن دارەکە شەهیدکرا. | پارستەی ناوی | کە : وشەی لێکدەرە.<br>پێشمەرگەکە : ناوە، تاکە، گشتییە، ناسراوە، جێگری بکەرە.<br>لەبن دارەکە : هاوەڵکاری شوێنییە، تەواوکەری کارە.<br>شەهیدکرا : کاری بکەر نادیارە ، تێپەرە. |
| ٣ | کو کۆمپیوتەر ل خوێندنگەهێ هەیە. | پارستەی ناوی | کو : وشەی لێکدەرە.<br>کۆمپیوتەر : ناوە ، تاکە ، گشتییە ، نەناسراوە ، بکەرە.<br>ل : ئامرازی پەیوەندییە.<br>خوێندنگەهێ : ناوە، تاکە، گشتییە، تەواوکەری بەیاریدەیە<br>هەیە : کاری رانەبردووی ئێستایە ، تێنە پەرە. |
| ٤ | کەباخەوانەکە هاتووە . | پارستەی ناوی | کە : وشەی لێکدەرە.<br>باخەوانەکە : ناوە ، تاکە ، گشتییە ، ناسراوە ، بکەرە.<br>هاتووە : کاری ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندنە ، تێنە پەرە. |

راهێنان ( ٤ ) لا پەرە ١١

بکـەر ← دەرنەکەفتیە کو نارین دێ هۆزانێن خۆ بەلاڤ کەت.
جێگری بکەر ← نازانرێ کو نارین دێ هۆزانێن خۆ بەلاڤ کەت.
بـەرکار ← مە نەزانییە کو نارین دێ هۆزانێن خۆ بەلاڤ کەت.

راهێنان ( ٥ ) لا پەرە ١١

| | |
|---|---|
| ١ ) کە ئێمە کوردین | پارستەی ناوییە |
| ٢ ) کە دووڕووە | پارستەی هاوەڵناوییە |
| ٣ ) خەبات بکەن | پارستەی هاوەڵکارییە |

## جۆرەکانی پارستە

١- ( نازانرێ کە ئاسۆ لە بەر چی دواکەوت ) لەم رستەیە ( **کە ئاسۆ لەبەرچی دواکەوت** ) دەبێتە
﴿ A- پارستەی ناوی B- پارستەی هاوەڵناوی C- پارستەی هاوەڵکاری D- شارستە ﴾.

٢- ( کە زەنگەکە لێدرا خوێندکارەکان چوونە ژوورەوە ) لەم رستەیە ( **کە زەنگەکە لێدرا** ) دەبێتە
﴿ A- پارستەی ناوی B- پارستەی هاوەڵناوی C- پارستەی هاوەڵکاری D- شارستە ﴾.

٣- ( ئەو چرایەی کە رووناک بوو، کوژایەوە. ) لەم رستەیە ( **کە رووناک بوو** ) دەبێتە
﴿ A- پارستەی ناوی B- پارستەی هاوەڵناوی C- پارستەی هاوەڵکاری D- شارستە ﴾.

٤- ( من نەزانییە کو سەردار دێ رۆمانی نڤیسیت ) لەم رستەیە ( **کو سەردار دێ رۆمانی نڤیسیت** ) دەبێتە
﴿ A- پارستەی ناوی B- پارستەی هاوەڵناوی C- پارستەی هاوەڵکاری D- شارستە ﴾.

٥- ( من ئەو دیت کو دکەنی ) لەم رستەیە ( **کو دکەنی** ) دەبێتە
﴿ A- پارستەی ناوی B- پارستەی هاوەڵناوی C- پارستەی هاوەڵکاری D- شارستە ﴾.

٦- ( وی دەرمان خوار بەلکی پێ چێبیت ) لەم رستەیە ( **بەلکی پێ چێبیت** ) دەبێتە
﴿ A- پارستەی ناوی B- پارستەی هاوەڵناوی C- پارستەی هاوەڵکاری D- شارستە ﴾.

٧- ( دەرنەکەڤتیە کو نارین دێ هۆزانێن خۆ بەلاڤ دکەت ) پارستەی ئەم رستەیە ئەرکی دەبێتە
﴿ A- بکەر B- بەرکار C- جێگری بکەر D- نیهاد ﴾.

٨- ( مە نەزانییە کو نارین دێ هۆزانێن خۆ بەلاڤ دکەت ) پارستەی ئەم رستەیە ئەرکی دەبێتە
﴿ A- بکەر B- بەرکار C- جێگری بکەر D- نیهاد ﴾.

٩- ( نازانرێ کو نارین دێ هۆزانێن خۆ بەلاڤ دکەت ) پارستەی ئەم رستەیە ئەرکی دەبێتە
﴿ A- بکەر B- بەرکار C- جێگری بکەر D- نیهاد ﴾

١٠- لە رستەی ئاوێتەدا ( پارستە ) A- لە سەرەتا دێ B- لە کۆتایی دێ C- وشەی لێکدەری لە پێش دێ D- لە ناوەراست دێ

١١- لە رستەی ئاوێتەدا ( وشەی لێکدەر ) A- لەپێش شارستە دێ B- لەپێش پارستەدێ C- لەناو شارستە دێ D- لەناو پارستە دێ

١٢- ( من نەزانییە کو سەردار دێ رۆمانی نڤیسیت ) لەم رستەیە ( من نەزانییە ) دەبێتە
﴿ A- پارستەی ناوی B- پارستەی هاوەڵناوی C- پارستەی هاوەڵکاری D- شارستە ﴾

# بـــــەركـــــار

**بەرکار:** ئەو ناوەیە یان جێناوەیە کە لە ڕستەدا مانای کاری تێپەڕ تەواو دەکات یان تەواو کردووە،( کاری ڕستەی بە سەردا دێ وە ناتوانین لە ڕستە فرێی بدەین ) .

**هەموو کارێکی تێپەڕ پێویستی بە ( بەرکار ) هەیە.**

ئەم وشانە دەبنە ( بەرکار) لە ڕستەدا

﴿ ناو - جێناوە سەربەخۆکان( کەسی سەربەخۆ - خۆیی -پرس - نیشانە - نادیار - هەیی ) - جێناوی لکاو - چاوگ ﴾

| | |
|---|---|
| ئاوارە سێو دەخوات. | بکەر بەرکار کاری ڕانەبردوو |
| گەل ئێمەی هەڵبژاردوە. | بکەر بەرکار کاری ڕابردوو |
| ئەو خۆی کوشت. | بکەر بەرکار کاری ڕابردوو |
| کێـــتـــان بـــرد بۆ پێشانگاکە؟ | بەرکار بکەر کار ئا.پ ت.بەیاریدە |
| ئەمە م خۆشدەوێت | بەرکار بکەر کار |
| من ڤلآنم بینی. | بکەر بەرکار کاری ڕابردوو |
| ناردمـــی بۆ بازار. | کار بەرکار بکەر ئا.پ ت.ب |
| خوێندنـــمان تەواوکرد. | بەرکار بکەر کار |

**تێبینی:**

دوو کۆمەڵە جێناوی لکاو ئەرکی ( بەرکار ) دەبینن ( ك١ - ك٢ )

کۆمەڵەی یەکەم ( م - مان - ت - تان - ی - یان ) لەگەڵ کاری ( **ڕابردوو - ڕانەبردوو - داخوازی** ) تێپەڕدا

کۆمەڵەی دووەم ( م - ین - یت - ن - Ø - ن ) لەگەڵ کاری **ڕابردووی تێپەڕدا**

**تێبینی:**

ئەگەر لەناو یەك کاردا دوو جێناوی لکاو هەبوو یەکیان ( بەرکار ) و یەکیان ( بکەر ) ە.

**هەڵی گرتم.** بکەر بەرکار

**هەڵی دەگرم.** بەرکار بکەر

**تێبینی:**

تەواوکەری کاری تەواو ئەمانەن ﴿ بەرکار - تەواوکەری بەیاریدە - هاوەڵکار ﴾

تەواوکەری کاری ناتەواو ئەمانەن ﴿ تەواوکەری ڕاستەوخۆی کاری ناتەواو - تەواوکەری بەیاریدەی کاری ناتەواو ﴾

تەواوکەری ڕاستەوخۆی کاری ناتەواو ﴿ ناو - چاوگ - جێناو - هاوەڵناو - هاوەڵکار ﴾

تەواوکەری بەیاریدەی کاری ناتەواو ﴿ ناو - چاوگ - جێناو ﴾

ڕاهێنان (١) لاپەرە ١٧

١- نان - تەماشا

٢- جەژنانە - جامێ پێوانە

٣- م ( دەمگرێ )

٤- ئەمام - ئەمام - فرمێسك.

٥- قوڵنگی یادی شیرین - یادگار.

راهێنان (٢) لاپەرە ١٨

*داهێن ڕێزمانی کوردی فێرکردین.

| | | |
|---|---|---|
| ئـ | فێرکردین | کاری رابردووی راگەیاندنە، لێکدراوە، تێپەڕە. |
| ب | ڕێزمانی کوردی | گرێی ناوییە ، بەرکارە. |
| پ | ین | جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی کۆ، بەرکارە |
| ت | ی | ئامرازی خستنەسەرە |
| ج | داهێن ڕێزمانا کوردی ئەم فێرکرین | |

راهێنان (٣) لاپەرە ١٨

بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە          لە باخچەی بەهار گوڵم چنیوە.

| وشە | شیکردنەوە |
|---|---|
| بە .... ەوە | ئامرازی پەیوەندییە. |
| ئاسمان | ناوە، تاکە، گشتییە، نەناسراوە، تەواوکەری بەیاریدەیە. |
| ئەستێرە | ناوە، تاکە، گشتییە، نەناسراوە، بەرکارە. |
| م | جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك، بکەرە. |
| دیوە | کاری رابردووی تەواوی راگەیاندنە ، تێپەڕە. |
| لە | ئامرازی پەیوەندییە |
| باخچەی بەهار | گرێی ناوییە، تەواوکەری بەیاریدەیە. |
| باخچە | ناوە، تاکە، گشتییە، نەناسراوە، تەواوکەری بەیاریدەیە. |
| ی | ئامرازی دانەپاڵە. |
| بەهار | ناوە، تاکە، گشتییە، نەناسراوە، دیارخەری ناوە |
| گوڵ | ناوە، تاکە ، گشتییە، نەناسراوە، بەرکارە. |
| م | جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك، بکەرە. |
| چنیوە | کاری رابردووی تەواوی راگەیاندنە ، تێپەڕە. |

راهێنانی (٤) لاپەرە ١٨

بۆ رابـردوو ← من ڕۆژنامەم کڕی.

بۆ رانەبردوو ← ئەو ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە .

بۆ داخـوازی ← ئێوە ڕۆژنامە بخوێننەوە.

---

## تەواوکەری کار ( بەرکار )

١- ( داهێن ڕێزمانی کوردی فێر کردین ) ( ڕێزمانی کوردی ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- بکەر B- دیارخەری ناو C- بەرکار D- جێگری بکەر ﴾.

٢- ( نازدار چێشت لێ دەنێت ) ناوی ( چێشت ) ئەرکی دەبێتە ﴿ A- بکەر B- بەرکار C- جێگری بکەر D- نیهاد ﴾.

٣- ( گەل ئێمەی هەڵبژاردووە ) جێناوی ( ئێمە ) ئەرکی دەبێتە ﴿ A- بکەر B- بەرکار C- دیارخەری ناو D- جێگری بکەر﴾

٤- ( ناردمی بۆ بازار ) جێناوی لکاوی ( م ) ئەرکی دەبێتە ﴿ A- بکەر B- بەرکار C- تەواوکەری بە یاریدە د- نیهاد﴾

٥- ( بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە ) ناوی ( ئەستێرە ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- بکەر B- بەرکار C- تەواوکەری بە یاریدە د- نیهاد﴾.

٦- ( بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە ) کاری ( دیوە )

﴿ A- ڕابردووی تێنەپەڕ B- ڕابردووی تێپەڕ C- ڕانەبردووی تێپەڕ D- داخوازی تێپەڕ﴾.

٧- ( لە باخچەی بەهار گوڵم چنیوە ) ناوی ( گوڵ ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- بکەر B- بەرکار C- دیارخەری ناو D- جێگری بکەر﴾.

٨- ( لە باخچەی بەهار گوڵم چنیوە ) کاری ( چنیوە )

﴿ A- ڕابردووی تێنەپەڕ B- ڕابردووی تێپەڕ C- ڕانەبردووی تێپەڕ D- داخوازی تێپەڕ﴾.

٩- ( لە پێشانگەکە کاروانم بینی ) ناوی ( کاروان ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- بکەر B- بەرکار C- تەواوکەری بە یاریدە د- نیهاد﴾

١٠- ( ئەو ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە ) کاری ئەم ڕستەیە

﴿ A- ڕابردووی تێنەپەڕ B- ڕابردووی تێنەپەڕ C- ڕانەبردووی تێپەڕ D- ڕانەبردووی تێنەپەڕ ﴾

١١- ( ئێوە ڕۆژنامە بخوێننەوە ) کاری ئەم ڕستەیە

﴿ A- ڕابردووی تێپەڕ B- ڕانەبردووی تێنەپەڕ C- داخوازی تێپەڕ D- ڕابردووی تێنەپەڕ ﴾

١٢- ( فلانم نارد بۆ پێشانگاکە ) جێناوی ( فلان ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- بکەر B- دیارخەری ناو C- بەرکار D- جێگری بکەر ﴾.

١٣- ( وێنەگرەکەیان گرت ) ناوی ( وێنەگر ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- بکەر B- بەرکار C- تەواوکەری بە یاریدە د- نیهاد﴾.

١٤- ( بەرکار ) لەگەڵ کام لەم کارانە دێت ؟

﴿ A- کاری ناتەواو B- ڕابردووی تێنەپەڕ C- ڕانەبردووی تێپەڕ D- داخوازی تێنەپەڕ ﴾

١٥- ( بەرکار ) لەگەڵ کام لەم کارانە دێت ؟

﴿ A- ڕابردووی تێپەڕ B- داخوازی تێپەڕ C- ڕانەبردووی تێپەڕ D- هەموویان ﴾

١٦- ( بەرکار ) لەگەڵ کام لەم کارانە نایەت ؟

﴿ A- ڕابردووی تێپەڕ B- داخوازی تێپەڕ C- ڕانەبردووی تێپەڕ D- ناتەواو ﴾

# تـەواوكـەری بـەیاریـدە

**تـەواوكـەری بـەیاریـدە:** ئەوناوەیە یان جێناوەیە كە لە ڕستەدا واتای كار تەواودەكات یان تەواوكردووە بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی. لە گەڵ هەموو جۆرە كارێكدا دێت. ( كاری تەواو - ناتەواو )- ( تێپەڕ - تێنەپەڕ ).

ئامرازە پەیوەندیەكان ئەمانەن: ﴿ بۆ، لە، بە، ە، دا، بەرەو، ژ، ژبۆ، تا، هەتا، ل، د....﴾

ئەم وشانە دەبنە ( تەواوكەری بەیاریدە ) لە ڕستەدا :

﴿ ناو - جێناوە سەربەخۆكان( كەسی سەربەخۆ - خۆیی - پرس - نیشانە - نادیار - هەیی ) - جێناوی لكاو - چاوگ ﴾

---

ئەم دچینـــە دهۆكێ.
بكەر كار ئا.پ ت. بەیاریدە

هەواڵەكە بـە ئێوە گەیشت.
بكەر ئا.پ ت. بەیاریدە

دیارییەكە م بـە خــۆت بەخشی.
بەركار بكەر ئا.پ ت. بەیاریدە كار

---

كتێبەكەم بۆ كێ هێنا؟
بەركار بكەر ئا.پ ت.بەیاریدە

خانووەكە بۆ ئەمانە بوو.
بەركار ئا.پ ت.بەیاریدە

نامەكە م بـە فـلان دا.
بەركار بكەر ئا.پ ت.بەیاریدە

دیارییەكە مان بۆ نارد ن.
بەركار بكەر ئا.پ ت.بەیاریدە

---

بە تێكۆشان دەگەینە ئامانج.
ئا.پ ت.بەیاریدە

ئێمە تا كەركوك چووین.
بكەر ئا.پ ت. بە یاریدە

ئەڤ كتێبانە ژبۆ قوتابیان هاتینە.
ئا.پ ت. بە یاریدە

**تێبینی:** دوو كۆمەڵە جێناوی لكاو ئەركی ( تەواوكەری بەیاریدە ) دەبینن ( لك١ - لك٢ )

كۆمەڵەی یەكەم ( م - مان - ت - تان - ی - یان ) لەگەڵ كاری ( ڕابردوو - ڕانەبردوو - داخوازی ) تێپەڕدا

كۆمەڵەی دووەم ( م - ین - یت - ن - Ø - ن ) لەگەڵ كاری ڕابردووی تێپەڕدا

**تێبینی/** كاتێك ( ناو - جێناوە سەربەخۆكان - چاوگ ) دەبنە تەواوكەری بەیاریدە ڕاستەوخۆ ئامرازی پەیوەندییان لە پێش دێ، بەڵام جێناوی لكاو كەدەبێتە تەواوكەری بەیاریدە مەرج نییە ئامرازی پەیوەندی لە پێش بێت. كتێبەكەم بۆ بهێنە.

**تێبینی/** ( ە ) دەبێتە ئامرازی پەیوەندی ئەگەر بە كۆتایی كاری ﴿ ڕابردوو - ڕانەبردوو- داخوازی ( ٢كۆ ) ﴾ وە دەتوانرێت یەكێك لەم ئامرازە پەیوەندیانە( بۆ - بە ) لەجێ دابنرێت.

| | | |
|---|---|---|
| كارزان هاتە قوتا بخانە. | كارزان هات بۆ قوتا بخانە. | ڕابردوو |
| چرا دەبێتە مامۆستا. | چرا دەبێت بە مامۆستا. | ڕانەبردوو |
| بـڕۆنـە زانـــكـۆ. | بـڕۆن بۆ زانـــكـۆ. | داخوازی |

---

ڕاهێنان (١) لا پەرە ٢٢

| دێر | بەركار | تەواوكەری بەیاریدە |
|---|---|---|
| ١ | ----- | دڵ – دەست |
| ٢ | ----- | قوڵنگی تیژی فەرهادی |
| ٣ | چەم | سورمەی خەمناكی |
| ٤ | ----- | بۆت نووسیوم ( تۆ بۆ منت نوسیوە )<br>بۆت بنوسم ( من بۆ تۆ بنوسم ) |
| | ----- | بەرزی |
| ٥ | هەستێكی سپی و جوان | لە هەموو ئاسمان - دڵ |
| ٦ | گیان | ڕێگای نیشتمان - پێی - فیردەوسی بەرین |



## ڕاهێنان (٢) لاپەرە ٢٢

| | ڕستە( بەرکار) | ڕستە( تەواوکەری بەیاریدە ) |
|---|---|---|
| وڵات | وڵاتەکەم دەپارێزم. | لە وڵاتەکەم دەژیم. |
| ڕۆژنامە | ڕۆژنامەم خوێندەوە. | هۆنراوەکەم لە ڕۆژنامە بڵاوکردەوە. |
| پێشمەرگە | پێشمەرگەکەم دیت. | چەکەکەم بۆپێشمەرگەکە نارد. |
| گوڵ | گوڵەکەم چاند | باخچە بە گوڵ جوانە. |
| پەرلەمان | ئێمە پەرلەمانمان دروست کرد. | من لە پەرلەمان کار دەکەم. |

## ڕاهێنان (٣) لاپەرە ٢٣

| | بەرکار | تەواوکەری بەیاریدە |
|---|---|---|
| ١ | ئەو ناوە یان جێناوەیە تەنها لەگەڵ کاری تێپەڕدا دێت وە کاری ڕستەکەی بە سەردا دێت. | ئەو ناوە یان جێناوەیە کە لە گەڵ هەموو جۆرە کارێکدا دێت و واتای کار زیاتر ڕوون دەکاتەوە. |
| ٢ | هیچ جۆرە ئامرازێکی لە پێش نایەت. | ئامرازی پەیوەندی لە پێش دێت. |
| ٣ | بە لابردنی ( بەرکار ) واتای ڕستە تێکدەچێ. | بە لابردنی ( تەواوکەری بەیاریدە ) واتای ڕستە تێك ناچێ ئەگەر کاری ڕستە کارێکی تەواو بێت. |
| | **ئازاد نانی خوارد.** | **ئازاد هات بۆ قوتابخانە.** |

## ڕاهێنانی (٤) لاپەرە ٢٤

ئەو کتێبان ژبۆ مە دکریت.

| وشە | شیکردنەوە |
|---|---|
| ئەو | جێناوی کەسی سەربەخۆیە، بۆ کەسی سێیەمی تاك ،بکەرە. |
| کتێبان | ناوە، کۆیە، گشتییە، نەناسراوە، بەرکارە. |
| ژبۆ | ئامرازی پەیوەندییە. |
| مە | جێناوی کەسی سەربەخۆیەبۆ کەسی یەکەمی کۆ، تەواوکەری بەیاریدەیە. |
| دکریت | کاری ڕانەبردووی ئێستایە، تێپەڕە. |
| یت | جێناوی لکاوە بۆکەسی دووەمی تاکە، بکەرە. |

مامۆستا لە هۆڵی قوتابخانەدا دیارییەکەی پێشکەش کردین.

| وشە | شیکردنەوە |
|---|---|
| مامۆستا | ناوە، تاکە، گشتییە، نەناسراوە، بکەرە. |
| لە...دا | ئامرازی پەیوەندییە. |
| هۆڵی قوتابخانە | گرێی ناوییە تەواوکەری بەیاریدەیە. |
| دیاری | ناوە، تاکە، گشتییە، ناسراوە، بەرکارە. |
| ەکە | نیشانەی ناسراوییە. |
| ی | جێناوی لکاوە بۆکەسی سێیەمی تاك، بکەرە. |
| پێشکەش کردین | کاری ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە، تێپەڕە. |
| ین | جێناوی لکاوە بۆکەسی یەکەمی کۆیە، بەرکارە. |



## تەواوکەری گار ( تەواوکەری بە یاریدە )

١- ( ئەڤ کتێبانە ژ بۆ قوتابییان هاتینە ) ناوی ( قوتابییان ) ئەرکی دەبێتە

A- بکەر B- بەرکار C- تەواوکەری بە یاریدە D- جێگری بکەر .

٢- ( ئەم رۆژنامەیەم خوێندەوە بۆتان ) جێناوی ( تان ) ئەرکی دەبێتە

A- نیهاد B- بکەر C- بەرکار D- تەواوکەری بە یاریدە .

٣- ( هۆنراوەکەم لە رۆژنامە بلاو کردەوە ) کاری ئەم رستەیە

A- رابردووی تێپەرە B- رابردووی تێنە پەرە C- رانەبردووی تێنە پەرە D- داخوازی تێپەرە .

٤- ( ئەم دچینە دهۆکێ ) ناوی ( دهۆک ) ئەرکی دەبێتە A- بکەر B- بەرکار C- تەواوکەری بە یاریدە D- جێگری بکەر

٥- ( هەوالەکە بە ئێمە گەیشت ) جێناوی ( ئێمە ) ئەرکی دەبێتە A- نیهاد B- بکەر C- بەرکار D- تەواوکەری بە یاریدە

٦- ( ئەم دچینە دهۆکێ ) کاری ئەم رستەیە

A- رابردووی تێپەڕ B- رابردووی تێنە پەڕ C- رانەبردووی تێنە پەڕ D- داخوازی تێپەرە .

٧- ( ئەم دچینە دهۆکێ ) ( ە ) لە کۆتایی ( دچینە ) دەبێتە

A- ئامرازی پەیوەندی B- ئامرازی خستنەسەر C- جێناوی لکاو D- ئامرازی لێکدەر .

٨- ( ئێمە تا کەرکوک چووین ) ( تا ) دەبێتە

A- ئامرازی پەیوەندی B- ئامرازی خستنەسەر C- ئامرازی لێکدەر D- جێناوی لکاو .

٩- ( مامۆستا لە هۆلی قوتابخانەدا دیاریەکەی پێشکەش کردین ) ( ی ) لە گرێی ( هۆلی قوتابخانە )

A- ئامرازی پەیوەندی B- ئامرازی خستنەسەر C- ئامرازی لێکدەر D- جێناوی لکاو .

١٠- ( مامۆستا لە هۆلی قوتابخانەدا دیارییەکەی پێشکەش کردین ) ( ی ) لە دوای ( دیارییەکە )

A- ئامرازی پەیوەندی B- ئامرازی خستنەسەر C- ئامرازی لێکدەر D- جێناوی لکاو .

١١- ( مامۆستا لە هۆلی قوتابخانەدا دیاریەکەی پێشکەش کردین ) ( ین ) ئەرکی دەبێتە

A- بکەر B- دیارخەری ناو C- بەرکار D- تەواوکەری بە یاریدە .

١٢- ( خانووەکە بۆ ئەمانە بوو ) کاری ئەم رستەیە

A- رابردووی تێپەرە B- رانەبردووی تێپەرە C- ناتەواوە D- داخوازی تێپەرە

١٣- ( دیاریەکە بە ئەوان ببەخشە ) کاری ئەم رستەیە A- رانەبردووە B- ناتەواوە C- داخوازییە D- رابردووە

١٤- ( بە تێکۆشان دەگەینە ئامانج ) ناوی ( ئامانج ) ئەرکی دەبێتە

A- بەرکار B- تەواوکەری کاری ناتەواو C- تەواوکەری بە یاریدە D- نیهاد .

١٥- ( تەواوکەری بەیاریدە ) لەگەڵ کام لەم کارانە دێت ؟

A- رابردووی تێنە پەڕ B- داخوازی تێپەڕ C- رانەبردووی تێپەڕ و تێنە پەڕ D- هەموویان

١٦- ( کام لەمانە کەدەبێتە تەواوکەری بەیاریدە مەرج نییە ئامرازی پەیوەندی لە پێش بێت ؟

A- جێناوی خۆیی B- جێناوی کەسی سەربەخۆ C- جێناوی لکاو D- جێناوی نیشانە

# جـێـنـاوی خـۆیـی

**جێناوی خۆیی:** ئەو جێناوەیە کە مانای خۆیەتی و خاوەنیەتی دەگەیەنێت کە جێناوی ( خۆ ) جێناوێکی هاوبەشە لە نێوان هەر شەش کەسی ( تاك و كۆ ) دا کاتێك جێناوە کەسییەلکاوەکانی دەخرێتە سەر دەبێتە جێناوێکی لێکدراو ، وەکو ( خۆم - خۆت - خۆی - خۆمان - خۆتان - خۆیان )

١) لە زمانی کوردیدا ئەم جێناوە سێ شێوەی هەیە :

أ. خۆ ← بیست و حەوت ساڵە من رەنجبەری تۆم　　　　به نان و ئاو و جل و بەرگی خۆم.

ب. خوە ← هەم ئەهلی ئەزەر ئەبین کو کرمانج　　　　ئیشقی ئەکرن ژبۆ خوە ئارمانج.

ج. خود ← ئەو خودی خۆی زیرەکە.

---

٢) جێناوی خۆیی لەدوو باردا بەکاردێ :

أ) بۆتەوکید کردنی ناویان جێناو بەکاردێ.　　　　وەك: ئەو خۆی نامەی نوسی.

ب) ئەگەر بکەرو بەرکاری ڕستە یەك بن ، ئەوا دەبێت جێناوی خۆیی بەکاربهێنین و نابێ فڕێ بدرێ. وەك : من خۆمم پێگەیاند.

لەم ڕستەیەدا ( بکەرو بەرکار ) یەك کەسن ( خۆم ) وەکو ( بەرکار ) بەکارهاتووە، بۆیە بوونی لە ڕستەکەدا پێویستە،ناتوانرێ لابرێ.

من خۆمم پێ گەیاند.

---

٣) ئەگەر جێناوی کەسی سەربەخۆ لە ڕستەدا لەگەڵ جێناوی ( خۆ ) بەکارهات و ( بکەر ) ی ڕستەکە بوو،ئەوا لەم کاتەدا سێ جێناو لە ڕستەکەدا کۆدەبنەوە دووانی سەربەخۆو ( من، خۆ ) لە گەڵ جێناوێکی لکاویش ، ئەم سێ جێناوەش پێویست نین لەڕستەکەدا بۆیە زۆر ئاسایی یە جێناوە سەربەخۆکان لابەین.وەك:

من خۆم نانم خوارد. ← خۆم نانم خوارد. ← نانم خوارد.

---

٤) جێناوی خۆیی لە ڕستەدا دەتوانێت هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێت:

١- بکـەر ← خۆم دەچم بۆ کتێبخانە.

٢- بـەرکار ← ئەو خۆی لە ئاوێنەدا دیت.

٣- نـیـهـاد ← خۆی ئەزان و ئەشارەزایە.

٤- گوزارە ( ت.کاری ناتەواو ) ← ئەوە خۆت بوویت کە لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچوویت.

٥- تەواوکەری بەیاریدە ← تۆ لە خۆتەوە هیچ کارێك مەکە.

٦- دیارخەری ناو ← کچەکەی خۆم نارد بۆ زانکۆ.

٧- جێـگـری بکەر ← خۆیان گیران.




---

٥) جێناوی ( خۆ ) دەگرێ بەتەنیا بەبێ هیچ زیادەیەك بەکاربێت وەك:　　خۆ بەخۆ دانیشتبوون.

٦) زۆر جار بۆ تەوکید و چەسپاندن ( خود ) دەخرێتە پێش ( خۆ ). وەك:　　کارەکە بە خودی خۆت ئەنجام بدە.

٧ ) هەندێ جار کە جێناوی لکاو دەخرێتەسەر جێناوی ( خۆی ) مۆرفێمی ( ش ، یش ) ی پەیوەندی وەردەگرێت ، جا لە پێش جێناوەکە بێت یان لە دوای. ﴿ خۆشم - خۆشت - خۆشی - خۆشمان - خۆشتان - خۆشیان ﴾

﴿ خۆمیش - خۆتیش - خۆیشی - خۆمانیش - خۆتانیش - خۆیانیش ﴾.

---

٨ ) جێناوی ( خۆ ) ئەگەر جێناوێکی دەستەی یەکەمی پێوە لکا ئەوا لەگەڵ کاری تێپەڕو تێنەپەڕ بەکاردێ.

خۆمان خانووەکەمان فرۆشت. ← تێپەڕ          خۆیان هاتن. ← تێنەپەڕ

بەڵام ئەگەر دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە لکا ، ئەوا تەنها لەگەڵ کاری تێپەڕ بەکاردێ.

زەویەکەی خۆتانمان فرۆشت.

* دەگونجێت جێناوێکی دەستەی یەکەم وجێناوێکی دەستەی دووەم بخرێتە سەر جێناوی ( خۆیی ).

ئەم کوڕانە برادەری خۆمن. ← ( م ) دەستەی یەکەم . ( ن ) دەستەی دووەم.

* دەگونجێت دوو جێناوێکی دەستەی یەکەم بخەینە سەر جێناوی خۆیی

خۆتم لێ مەکە بە بلیمەت. ← ( ت ) دەستەی یەکەم. ( م ) دەستەی یەکەم.

---

٩ ) هەرکاتێ جێناوی ( خۆ ) بە وشەی ترەوە لکا وشەی ناسادە ( دارژاوو لێکدراو ) دروست دەکات. وەك :

دارژاو ← خۆیەتی - لەخۆوە - خۆیی - بەخۆ

لێکدراو ← خۆپەسەند - خۆخۆر - خۆویست - خۆکوژ

---

١٠ ) لە شێوەزاری کرمانجی ژووروودا جێناوی ( خۆ - خوە ) بەتەنیا بەکاردێن و جێناوی لکاوی ناخرێتەسەر.

---

١١ ) جێناوی( خۆ ) لەرووی رەگەزو ژمارەو دۆخەوە بێ لایەنە.

ئازادی کوڕێ خۆ نەهێنایە ← نێر          ئازداری خۆ ئامادەکردیە ← مێ

---

١٢ ) أ ) جێناوی خۆیی لەکرمانجی ژووروودا ئەگەر ئەرکی ( بکەر - نیهاد - جێگری بکەر ) بوو، ئەوا پێشگری( ب ) ی دەخرێتە سەر وەك:

بکەر ← ئەز ب خۆ هاتم.

جێگری بکەر ← ئەو ب خۆ هاتە گرتنێ .

نیهاد ← ئەو ب خۆ ئەزانە .

---

ب ) جێناوی خۆیی لەکرمانجی ژووروودا ئەگەر ئەرکی ( بەرکار )ی بینی ئەوا پێشگری ( ب ) ناخرێتە پێش ← من خۆ کوشت.

---

راهێنان (١) لاپەرە ٣٢

| ئەرك | رستە |
|---|---|
| بکەر | خۆم دەچم بۆ بازاڕ. |
| تەواوکەری کاری ناتەواو | ئەمە خۆی بوو. |
| نیهاد | خۆی زیرەکە. |
| دیارخەری ناو | لە وڵاتی خۆمان دەژین. |
| جێگری بکەر | خۆی کوژرا. |

## ڕاهێنان (٢) لاپەڕە ٣٣




١- بە منداڵەکانی خۆمانمان خوێند.
٢- دوێنێ خۆتان پارەکانتان لێ سەندین.
٣- خۆیان لێرە نین خوایان لێرەیە.
٤- ئێمە خۆمان کارەکان جێ بەجێ دەکەین.

## ڕاهێنان (٣) لاپەڕە ٣٣

١) جێناوەی (خۆ) لە کرمانجی ژووروودا پێشگری (ب) دەخرێتە پێش، ئەگەر ئەرکی (بکەر، نیهاد، جێگری بکەر)ی بینی.

ئەم ب خۆ چووین. --- بکەر ئەو ب خۆ زیرەکە. --- نیهاد ئەو ب خۆ هاتە کوشتن. --- جێگری بکەر

---

٢) جێناوی (خۆیی) لەدوو باردا بەکاردێ :

أ- بۆ تەوکید (جەخت) کردنی (ناو) یان (جێناو). وەك نەسرین خۆی هات. ئەو خۆی هات.

ب- ئەگەر بکەرو بەرکاری ڕستە یەك بن، ئەوا دەبێت جێناوی خۆیی بەکاربێت وناب‌ێ لابرێ. من خۆمم پەروەردە کرد.

---

٣) جێناوی خۆیی ئەگەر بۆ تەوکیدکردن بەکارهات، ئەوا ئاساییە لابرێ. یان ئەگەر لە ڕستەیەکدا جێناوێکی سەربەخۆو جێناوێکی خۆیی بەکارهات و بکەری ڕستەکەبوو، ئەوا دەتوانرێ جێناوی خۆیی لابرێ، چونکە کۆبوونەوەی سێ جێناو لە ڕستەیەکدا پێویست نیە.

من خۆم نانم خوارد --- من نانم خوارد --- نانم خوارد.

---

٤) جێناوی (خۆ) ئەگەر بەتەنها یەك جێناوی دەستەی یەکەمی وەرگرت، ئەوا لەگەڵ کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ بەکاردێ.

خۆیان خانووەکەیان کری --- تێپەڕ. خـۆی هـــات --- تێنەپەڕ.

---

٥) جێناوی خۆیی مۆرفیمی (ش- یش) ی پەیوەندی وەردەگرێ، ئەگەر لەگەڵ جێناوی لکاو بەکارهاتبوو.

خۆشم - خۆشت - خۆشی - خۆشمان - خۆشتان - خۆشیان.
خۆمیش - خۆتیش - خۆیشی - خۆمانیش - خۆتانیش - خۆیانیش.

## ڕاهێنان (٤) لاپەڕە ٣٤

١) بۆ خۆمان لە وڵاتی خۆمان بە ئاسودەیی ژیان بەسەر دەبەین.
٢) بستێ لە خاکی خۆم بە هەموو زێڕی دنیا ناگۆڕمەوە.
٣) پیرێ خۆی قسەی لە گەڵمدا کرد.
٤) لە گەڵ برای خۆیان چوون بۆ دەرەوە.
٥) لە خۆتەوە وەڵامی هیچ پرسیارێك مەدەوە.

## ڕاهێنان (٥) لاپەڕە ٣٥

١- خۆت --- جێناوی خۆییە بۆ کەسی دووەمی تاك، تەواوکەری بەیاریدەیە
٢- خۆم --- جێناوی خۆییە بۆ کەسی یەکەمی تاك، بکەرە
٣- ب خۆ --- جێناوی خۆییە بۆ کەسی سێیەمی تاك، جێگری بکەرە




07507977770
morden office

# جێناوی خۆیی

١- ( ئەو خۆی لە ناوێنەدا دیت ) جێناوی ( خۆی ) ئەرکی دەبێتە

A- بکەر B- بەرکار C- جێگری بکەر D- تەواوکەری بەیاریدە.

٢- ( کچەکەی خۆم نارد بۆ زانکۆ ) جێناوی ( خۆم ) ئەرکی دەبێتە

A- بکەر B- بەرکار C- دیارخەری ناو D- تەواوکەری بەیاریدە

٣- لە زمانی کوردیدا جێناوی خۆیی چەند شێوەی هەیە ؟

A- یەك شێوە B- دووشێوە C- سێ شێوە D- چوار شێوە

٤- جێناوی خۆیی لە چەند باردا بەکار دێت ؟

A- یەك بار B- دوو بار C- شەش بار D- سێ بار

٥- جێناوی خۆیی ئەگەر یەك جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە لکا بەکار دێت لەگەڵ کاری

A- تەنها تێپەڕ B- تەنها تێنەپەڕ C- تێپەڕو و تێنەپەڕ D- هیچیان

٦- جێناوی خۆیی ئەگەر دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە لکا بەکار دێت لەگەڵ کاری

A- تێپەڕ B- تێنەپەڕ C- تێپەڕو تێنەپەڕ D- هیچیان

٧- جێناوی ( خـۆ ) لە رووی رەگەزەوە

A- نێرە B- مێیە C- دولایەنە D- بێلایەنە

٨- ( لە خۆتەوە هیچ کارێك مەکە ) جێناوی ( خۆت ) ئەرکی دەبێتە

A- بکەر B- جێگری بکەر C- تەواوکەری بەیاریدە D- نیهاد

٩- ( لە وڵاتی خۆمان دەژین ) جێناوی ( خۆمان ) ئەرکی دەبێتە

A- تەواوکەری بەیاریدە B- بکەر C- تەواوکەری بەیاریدە D- دیارخەری ناو

١٠- ( ئەمە خۆی بوو ) جێناوی ( خۆی ) ئەرکی دەبێتە

A- نیهاد B- تەواوکەری کاری ناتەواو C- بەرکار D- نیهاد

١١- جێناوی ( خۆ ) پێشگری ( ب ) وەردەگرێ لەکرما نجی ژووروودا ئەگەر ئەرکی ببێتە

A- بەرکار B- دیارخەری ناو C- نیهاد D- هیچیان.

١٢- جێناوی ( خۆ ) پێشگری ( ب ) وەردەگرێ لەکرما نجی ژووروودا ئەگەر ئەرکی ببێتە

A- دیاخەری ناو B- تەواوکەری بەیاریدە C- بکەر D- هیچیان

١٣- جێناوی ( خۆ ) پێشگری ( ب ) وەردەگرێ لەکرما نجی ژووروودا ئەگەر ئەرکی ببێتە

A- بەرکار B- تەواوکەری کاری ناتەواو C- جێگری بکەر D- هیچیان

١٤- جێناوی ( خۆ ) پێشگری ( ب ) وەرناگرێت لەکرما نجی ژووروودا ئەگەر ئەرکی ببێتە

A- بەرکار B- تەواوکەری بەیاریدە C- بکەر D- هیچیان

١٥- ( ئەم ب خۆ چووین ) جێناوی ( ب خۆ ) ئەرکی دەبێتە

A- بەرکار B- تەواوکەری بەیاریدە C- بکەر D- نیهاد

١٦- ( ئەو ب خۆ هاتە کوشتن ) جێناوی ( ب خۆ ) ئەرکی دەبێتە

《 A- بکەر　　B- تەواوکەری بەیاریدە　　C- نیهاد　　D- جێگری بکەر 》.

١٧- ( خۆیان شارەزان ) جێناوی ( خۆیان ) ئەرکی دەبێتە

《 A- بکەر　　B- نیهاد　　C- جێگری بکەر　　D- بەرکار 》

١٨- ( وێ خۆ کوشت ) جێناوی ( خۆ ) ئەرکی دەبێتە

《 A- بکەر　　B- بەرکار　　C- نیهاد　　D- جێگری بکەر 》

١٩- ( من خۆمم پەروەردە کرد ) جێناوی ( خۆم ) ئەرکی دەبێتە

《 A- بکەر　　B- بەرکار　　C- نیهاد　　D- جێگری بکەر 》

٢٠- ( منداڵەکانی خۆم خۆشدەوێن. ) جێناوی ( خۆم ) ئەرکی دەبێتە

《 A- بکەر　　B- بەرکار　　C- نیهاد　　D- دیارخەری ناو 》

---

ئامادەکردنی م. عومەر ئەحمەد خدر　　ئامادەیی ئازادیی کوڕان و ئامادەیی زانیاریی ئەهلی

# جــێـنـاوی هــەیــی

**جێناوی هەیی : ئەو جێناوەیە کە بۆ خاوەنێتی بە کار دەهێندرێت وە خاوەنەکەی دەشێ ناو یان جێناو بێت وە لە رستەدا بەزۆری ئەرکی ئەو ناوەی پێ دەسپێردرێ کە جێی دەگرێتەوە.**

جێناوە هەیی یەکان ئەمانەن :

**( هی - ئی ) لە کرمانجی خوارووا بەکاردێ ( نێر و مێ ) ی نییە و رەگەز نیشان نادات، دەتوانین لەجیاتی هی ( هین ) بەکاربهێنین.**

**جێناوی هەیی هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێت، جگە لە ( دیارخەری ناو )**

دیوار ی باخەکە ی ئێوە رووخاوە هی باخەکە ی ئێمە نەرووخاوە.
ناو ئا.خ ناو ئا.خ جێناو کار ج. هەیی ناو ئا.خ جێناو کار
بکەر بکەرە

بـەو قەلەمـە ی من مەنووسـە بە هی خۆت بنووسـە
ها.نیشانە ناو ئا.خ جێناو کار جێناو ئا.پ ج.هەیی ج.خۆیی کار جێناو
ت.بەیاریدە ت.بەیاریدە

یـا - ئـا ← بۆ تـاکی مێ
ێ - ئێ ← بۆ تـاکی نێر — کرمانجی ژووروو
یێن - ئێن ← بۆ کۆی نێر و مێ

ب دەستێن من ماری نـەکوژە ب یێن خۆ بکوژە
ئا.پ ناو ئا.خ جێناو ناو کار جێناو ئا.پ ج.هەیی ج.خۆیی کار
ت.بەیاریدە بکەر ت.بەیاریدە

کتێبـا من مەخوێنـە یـا خۆ بخوێنـە
ناو ئا.خ جێناو کار ج. هەیی ج.خۆیی کار جێناو
بەرکار بەرکارە بکەر

---

## راهێنان ( ١ ) لا٣٨

١- هی ← لە جێی ناوی ( نمرە )
٢- هی ← لە جێی ناوی ( ئەسپ )
٣- هی ← لە جێی ناوی ( ئاهەنگ )
٤- یێن ← لە جێی ناوی ( پەرتووك )
٥- هی ← لە جێی ناوی ( مامۆستا )

## راهێنان ( ٢ ) لا پەرە ٣٩

١- یێ .
٢- یێ.
٣- هی.
٤- یا.
٥- هی.

## ڕاهێنان ( ٣ ) لا پەرە ٣٩

١- وتاری یەکەم هی فیسار بوو .

| وشە | شیکردنەوە |
|---|---|
| وتاری یەکەم | گرێی ناوییە،نیهادە |
| هی | جێناوی هەبیە دیارخراوە. |
| فیسار | جێناوی نادیارە ، دیارخەری جێناوی هەبیە. |
| هی فیسار | گرێی ناوییە،تەواوکەری کاری ناتەواوە |
| بوو | کاری ناتەواوە بۆ کاتی ڕابردوو ، تێنە پەڕە. |

٢- باخچێ مە ژ یێ وە جوانترە .

| وشە | شیکردنەوە |
|---|---|
| باخچێ مە | گرێی ناوییە نیهادە. |
| باخچە | ناوە، تاکە،گشتییە، ناسراوە،نیهادە، |
| ێ | ئامرازی دانەپاڵە بۆ تاکی نێر. |
| مە | جێناوی کەسی سەربەخۆیە بۆکەسی یەکەمی کۆ، دیارخەری ناوە |
| ژ | ئامرازی پەیوەندییە. |
| یێ | جێناوی هەبیە تەواوکەری بەیاریدە یە. |
| وە | جێناوی کەسی سەربەخۆیە بۆکەسی دووەمی کۆ، دیارخەری جێناوە |
| جوانتر | هاوەڵناوی چۆنیەتی پلەی بەراوردە ، تەواوکەری کاری ناتەواوە. |
| ە | کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا، تێنە پەڕە. |

٣- شۆڕشی کوردستان هی گەلی کوردە.

| وشە | شیکردنەوە |
|---|---|
| شۆڕشی کوردستان | گرێی ناوییە ، نیهادە. |
| شۆڕش | ناوە،کۆیە،گشتییە،ناسراوە،نیهادە. |
| ی | ئامرازی دانەپاڵە. |
| کوردستان | ناوە، تاکە، تایبەتییە، ناسراوە، دیارخەری ناوە. |
| هی | جێناوی هەبیە دیارخراوە. |
| گەلی کورد | گرێی ناوییە دیارخەری جێناوی هەبیە. |
| هی گەلی کورد | گرێی ناوییە تەواوکەری کاری ناتەواوە. |
| ە | کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا، تێنە پەڕە. |

## ڕاهێنان ( ٤ ) لا پەرە

١) تیپەکەی ئێمە سەرکەوت هی ئێوە سەرنەکەوت.

٢) ڕۆمانی من مەخوێنەوە هی خۆت بخوێنەوە.

٣) کتێبەکەی ئەو لە هی من پاکترە.

# جێناوی هەیی

١- جێناوی ( هەیی ) هەرگیز یەکێك لەم ئەرکانە نابینێت
﴿ A- بکەر  B- دیارخەری ناو  C- بەرکار  D- تەواوکەری بەیاریدە ﴾.

٢- جێناوی هەییە لەکرمانجی ژوورووودا بۆ تاکی ( نێر ) بریتییە لە ﴿ A- یا  B- ئی  C- یێ  D- ییێن ﴾

٣- جێناوی هەییە لەکرمانجی ژووروودا بۆ تاکی ( مێ ) بریتییە لە ﴿ A- یا  B- هی  C- ییێ  D- ییێن ﴾

٤- جێناوی هەییە لەکرمانجی ژووروودا بۆ کۆی ( نێر و مێ ) بریتییە لە ﴿ A- یا  B- ئی  C- ییێ  D- ییێن ﴾

٥- ( کتێبێ من مە خوێنەرەوە هی خۆت بخوێنەرەوە. ) جێناوی ( هی ) ئەرکی بریتییە لە
﴿ A- بکەر  B- دیارخەری ناو  D- دیارخەری ناو  D- بەرکار ﴾.

٦- ( ب دەستێن من ماری نەکوژە ب یێن خۆ ماری بکوژە. ) جێناوی ( یێن ) ئەرکی دەبێتە
﴿ A- بکەر  B- تەواوکەری بەیاریدە  C- بەرکار  D- نیهاد ﴾.

٧- ( دیواری باخەکەی ئێوە رووخاوە هی باخەکەی ئێمە نەرووخاوە. ) جێناوی ( هی ) شوێنی یەکێك لەمانەی گرتووەتەوە
﴿ A- باخ  B- دیوار  C- ئێوە  D- رووخاو ﴾

٨- ( نمرەی نەسرین لە هی من بەرزترە. ) جێناوی ( هی ) ﴿ A- نێرە  B- مێیە  C- بێ لایەنە  D- دوولایەنە ﴾

٩- (وتاری یەکەم هی فیسار بوو. ) گرێی ناوی ( هی فیسار ) ئەرکی دەبێتە
﴿ A- نیهاد  B- تەواوکەری کاری ناتەواو  C- دیارخەری ناو  D- بکەر ﴾

١٠- کام لەم بەتەنیا ناتوانێت ببێتە تەواوکەری کاری ناتەواو
﴿ A- ناو  B- جێناوی خۆیی  C- هاوەڵناوی بکەر دارژاو  D- جێناوی هەیی ﴾

١١- ( ئەڤە گوندێ مە نینە، گوندێ ئەوانە. ) لەشوێنی ناوی ( گوند ) دەتوانین یەکێك لەم جێناوە هەییانە دابنێین
﴿ A- یا  B- یێ  C- یێن  D- هی ﴾.

١٢- ( ئۆتۆمبێلەکەی ئەو سووتا هی تۆ نەسووتا. ) جێناوی ( هی ) ئەرکی بریتییە لە
﴿ A- بکەر  B- دیارخەری ناو  D- دیارخەری ناو  D- بەرکار ﴾.

١٣- ( کچەکەی من زیرەکە هی تۆ زیرەك نییە. ) گرێی ناوی ( هی تۆ ) ئەرکی دەبێتە
﴿ A- نیهاد  B- تەواوکەری کاری ناتەواو  C- دیارخەری ناو  D- بکەر ﴾

١٤- ( پوشەکەی تۆ سووتێنرا هی من نەسوتێنرا. ) گرێی ناوی ( هی من ) ئەرکی دەبێتە
﴿ A- نیهاد  B- جێگری بکەر  C- دیارخەری ناو  D- بکەر ﴾

---

# هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو

**هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو**: وشەیەکە کە بەزۆری لە چاوگ دروست دەکرێ بەهۆی پێشگرو پاشگرەوە، وە هەندێکیان هەیە لە ناو و پاشگر دروست دەکرێت کە ئەم جۆرە هاوەڵناوە دەلالەت لە (کارکەر) دەکات و واتای بکەری دەبەخشێت.

*ڕێگاکانی دروست کردنی هاوەڵناوی بکەری دارژاو :

یەکەم : ناو+ پاشگر ---- دەکرێتە دوو بەش :

أ) ناوی واتایی + پاشگر (مەند، بار، گەر، گار، وان، ڤان، ناك، وەر)

﴿ هۆشمەند، بیرمەند، بەهرەمەند، تاوانبار، ستەمبار، دادگەر، ستەمگەر، پەروەردگار، مەلەوان، هۆزانڤان، خەمناك، ترسناك، هونەروەر، بەهرەوەر، دادوەر ....﴾

ب) ناوی بەرجەستە+ پاشگر (ەوا، ەوان، ڤان، ندە، وەر)

﴿ نانەوا، شاخەوان، دارڤان، باڵندە، سەروەر .....﴾

دووەم : ڕەگی کار+ پاشگر (ەر- یار - ندە - ۆك - ەك - ا )

﴿ نووسەر، خوێنەر، کڕیار ،فرۆشیار، کوشندە، دڕندە، گەڕۆك ،مژۆك،خشۆك، کوژەك، زانا، بینا .... ﴾

سێیەم : پێشگر (ب - نە ) + ڕەگی کار

﴿ بمر، نەمر، بنووس ، بگۆڕ، نەگۆڕ، بکوژ، نەکوژ، بسۆت ..... ﴾

چوارەم : پێشگر (ب - نە ) + ڕەگی کار + پاشگر (ەر)

﴿ بخۆر ، نەخۆر، بکەر، نەکەر ... ﴾

پێنجەم : قەدی چاوگی تێنەپەر + پاشگر (و- وو - ی )

﴿ نوستوو، نوستی ، مردوو، مردی، فڕیو، بەزیو، بەزیی ..... ﴾

شەشەم : قەدی چاوگی تێپەڕ + پاشگر (ەوار- ڤان - ەڤان )

﴿ خوێندەوار، پەرستڤان - خوێندەڤان.....﴾

---

مرۆڤـــــی نووســەر خزمەت دەکات.
ناوە.بکەر ئـ.دانەپاڵ هاوەڵناوی بکەری دارژاوە
دیارخەری ناوی مرۆڤە

دەرد ی کوشندە دەرمانی نی یە.
ناوە.نیهادە ئـ.دانەپاڵ هاوەڵناوی بکەری دارژاوە
دیارخەری ناوی دەردە

ب دەســـتــــــــێن لەرزۆك ژینا خۆ نەبوورینە.
ناوە .ت.بەیاریدە ئـ.دانەپاڵ هاوەڵناوی بکەری دارژاوە
دیارخەری ناوی( دست )ە

جگەرەکێشان کـــوشــنــــدە یــــــــــە
هاوەڵناوی بکەری دارژاوە ناوبەندە کاری ناتەواو
ت.کاری ناتەواوە.

---

**تێبینی**/ ئەو هاوەڵناوە بکەریە دارژاوانەی کە لە ڕەگی کار و پاشگری (ندە) دروست دەبن بە زۆری بۆ کار سیفەتێکی ناجێگیر بەکار دێن وەکو دەڵێن (کوشندە) کە مەبەستمان کەسێکە یان شتێکە کە کاری کوشتنەکە ئەنجام دەدات و بە ئەنجام دانی کارەکە سیفەتەکەی لە سەر لادەچێت.

**تێبینی**/ ئەو هاوەڵناوە بکەرییە دارژاوانەی کە لە ڕەگی کار و پاشگری (ا) دروست دەکرێن جۆرە بەردەوامی و جێگیریەك لە کارو سیفەتەکانی ئەواندا هەیە وەك (زانا) واتا کەسێك بە بەردەوامی ئەو سیفەتەی تێدا هەبێت.

تێبینی/ پاشگری (کار - گەر) کە دەخرێنە سەر ناوی واتایی و دەیکەنە هاوەڵناوی بکەری دارژاو جۆرە موبالەغەو زیادەڕۆییەك لە سیفەتەکەیدا دروست دەبێت بۆ نموونە (ستەمکار - ستەمگەر) کەسێکە زوڵم و ستەمێکی زۆری لێ چاوەڕوان دەکرێت.

تێبینی/ پاشگری (گەر) کە خرایە سەر ناوی بەرجەستە نایکات بە هاوەڵناوی بکەری دارژاو، بەڵکو دەیکاتە (ناوی پیشە) وەك: ئاسنگەر، دەرمانگەر، مسگەر....

تێبینی/ هاوەڵناوی بکەری دارێژراوی وەك (کڕیار - فرۆشیار...) پێدەچێت ئەو پاشگرەی کە خراوەتە سەر رەگی کارەکە (ار) بێت بەڵام بۆ سوکی دەربڕین بووە بە (یار) ئەو (ی) یە وەکو ناوبەند بەکارهاتووە.

تێبینی/ پاشگری(ناك) کە دەخرێتە سەر ناوی واتایی هاوەڵناوی بکەری دارێژراو دروست دەبێت، هاوەڵناوەکە واتای ناخۆشی لێ بەدی دەکرێت وەك: ترسناك ، خەمناك ....

تێبینی/ زۆربەی ئەو چاوگە دارێژراوانەی کە بە هۆی پێشگری « هەڵ - دا - را » دروست دەبن هاوەڵناوی بکەری دارێژراویان تەنها بە هۆی رەگی کارەوە لێ دروست دەکرێت وەك: (هەڵگرتن .. هەڵگر) - (داگرتن .. داگر) - (راماڵین .. راماڵ)

تێبینی/ هاوەڵناوی بکەری دارژاو ئەگەر درایە پاڵ ناو یان جێناو ئەوا دەبێتە هاوەڵناو، بەلام ئەگەر نەدرایە پاڵ ناو یان جێناو یان وەسفی ناوی نەکرد ئەوا دەبێ بە ناو. مرۆڤـــــی نـانـەوا نان دروست دەکات . نانەواکە هات.

ناو نا.داتە پاڵ هاوەڵناوی بکەری دارژاو ناوە

---

تێبینی// هاوەڵناو لەرستەدا ئەرکی دەبێتە « دیارخەری ناو یان جێناو یان هاوەڵناو - تەواوکەری کاری ناتەواو ».............. هەر ئەرکێکی تر ببینێ هاوەڵناو نییە

راهێنان ((١)) لا ٤٧

| ژمارە | هاوەڵناوی بکەری دارژاو | دەستوری دروست کردن |
|---|---|---|
| ١ | ــــــــــ | ــــــــــ |
| ٢ | هۆشیار | ناوی واتایی (هۆش) + ناوبەندی (ی) + پاشگری (ار) |
| ٣ | پەرستڤان | قەدی چاوگی (پەرست) + پاشگری (ڤان) |
| ٤ | گەیشتوو | قەدی چاوگی (گەیشت) + پاشگری (وو) |
| ٥ | خەتابار | ناوی واتایی (خەتا) + پاشگری (بار) |
| ٦ | ــــــــــ | ــــــــــ |

راهێنان ((٢)) لا ٤٨

| چاوگ | هاوەڵناوی بکەری دارژاو | چۆنیەتی دروست کردن |
|---|---|---|
| سوتاندن | سوتێنەر | رەگی کار (سوتێن) + پاشگری (ەر) |
| گۆڕین | نەگۆڕ | پێشگری (نە) + رەگی کاری (گۆڕ) |
| نشستن | نشستی | قەدی چاوگی (نشست) + پاشگری (ی) |
| تێکردن | تێکەر | رەگی کار (تێکە) + پاشگری (ەر) |
| هەڵکەفتن | هەڵکەفتی | قەدی چاوگی (هەڵکەفت) + پاشگری (ی) |

## راهێنان ((٣)) لا ٤٩

١) ئەو هاوەڵناوانەی بە هۆی پاشگری (ەر- گەر)ەوە دروست دەبن هەم لە رووی سیفەتەوە هەم لە رووی دروستبوون جیاوازیان هەیە

أ/لە رووی دروست بوون :

| ڕەگی کار+پاشگری (ەر) | ناوی واتایی + پاشگری (گەر) |
|---|---|
| خوێنەر، نووسەر | دادگەر، ستەمگەر |

ب/ لە رووی سیفەتەوە :

ئەو هاوەڵناوانەی بە پاشگری (ەر) دروست دەبن سیفەتەکەیان سیفەتێکی ئاساییە، بەڵام ئەو هاوەڵناوانەی بە پاشگری (گەر) دروست دەبن جۆرە موبالەغەو زیادەڕۆییەك لە سیفەتەکەیدا هەیە، وە ئەو هاوەڵناوانەی بە پاشگری (ەر) دروست دەبن هەندێ سیفەتی بەردەوامیان هەیە.

---

٢) ﴿ستەمگەر - ئاسنگەر﴾

أ/ شێوەی دروست کردن :

| ستەمگەر | ئاسنگەر |
|---|---|
| ناوی واتایی(ستەم) + پاشگر (گەر) | ناوی بەرجەستە(ئاسن) + پاشگر (گەر) |

ب/ لە رووی مەبەستی بەکارهێنان :

ستەمگەر: هاوەڵناوی بکەری دارِژاوە. ئاسنگەر: ناوی پیشەیە.

---

## راهێنانی ((٤)) لا ٤٩

١. زانا ← هاوەڵناوی بکەری دارِژاوە { رەگی کار(زان) + پاشگر (ا) }
٢. تێگەیشتوو ← هاوەڵناوی بکەری دارِژاوە { قەدی چاوگی تێنەپەڕ + (تێگەیشت) + پاشگر (وو) }
٣. زانا+ تێگەیشتوو ← دیارخەری ناوی (گەل) ە
٤. زانـــــــا ← بیـنـا
٥. تێگەیشتوو ← کەوتوو

---

## راهێنانی ((٥)) لا ٤٩

| چاوگ | چۆنیەتی دروست کردن | هاوەڵناوی بکەری دارِژاو | رستە |
|---|---|---|---|
| بەزین | ١. قەدی چاوگ (بەزی) + پاشگر (و) | بەزیو | مرۆڤی بەزیو دڵتەنگە. |
| | ٢. پێشگر (نە) + رەگی کار (بەز) | نەبەز | گەلی نەبەز سەربەرزە. |
| مردن | ١. قەدی چاوگ (مرد) + پاشگر (وو) | مردوو | گۆشتی ئاژەڵی مردوو مەخۆ. |
| | ٢. پێشگر (نە) + رەگی کار (مر) | نەمر | شەهید نەمرە. |



## هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو

١- ( مرۆڤی نووسەر خزمەت دەکات ) وشەی ( نووسەر ) بریتییە لە

﴿ A- ناو B- هاوەڵناو C- هاوەڵکار D- جێناو ﴾

٢- ( نووسەرەکەم بینی ) وشەی ( نووسەر ) بریتییە لە

﴿ A- ناو B- هاوەڵناو C- جێناو D- هاوەڵکار ﴾

٣- هاوەڵناوی ( تاوانبار ) پێك دێت لە

﴿ A- ( ناو + پاشگر ) B- ( هاوەڵناو + پاشگر ) C- ( ناو + ناو ) D- هاوەڵناو + ناو ﴾

٤- هاوەڵناوی ( خوێنەر ) پێك دێت لە

﴿ A- ( ناو + پاشگر ) B- ( رەگی کار + پاشگر ) C- ( قەدی چاوگ + پاشگر ) D- هیچیان ﴾

٥- ( دەردی کوشندە دەرمانی نییە ) گرێ ی ناوی ( دەردی کوشندە ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- بکەر B- بەرکار C- جێگری بکەر D- نیهاد ﴾ .

٦- هاوەڵناوی ( ستەمگەر ) پێك دێت لە

﴿ A- ناوی بەرجەستە + پاشگر B- ناوی واتایی + پاشگر C- هاوەڵناو + پاشگر D- ناو + ناو ﴾

٧- ( کەسی نووستوو بێ ئاگایە ) هاوەڵناوی ( نووستوو ) پێك دێت لە

﴿ A- رەگی کار + پاشگر B- ناو + پاشگر C- هاوەڵناو + پاشگر D- قەدی چاوگ + پاشگر ﴾

٨- یەکێك لەم پاشگرانە کە دەچێتە سەر ( رەگی کار ) جۆرە بەردەوامییەك لە کار و سیفەتەکەی دروست دەکات.

﴿ A-ناك B- ەر C- ا D- یار ﴾

٩- مرۆڤی نانەوا نان دروست دەکات ) وشەی ( نانەوا ) بریتییە لە

﴿ A- ناو B- هاوەڵناوی بکەری دارژاو C- هاوەڵناوی کراوی دارژاو D- جێناو ﴾

١٠- هاوەڵناوی ( خەتابار ) پێك دێت لە

﴿ A- ناو + پاشگر B- ناو + ناو C- هاوەڵناو + ناو D- جێناو + پاشگر ﴾

١١- ( ئارامی فرۆشیار دەرکەوت ) هاوەڵناوی ( فرۆشیار ) پێك دێت لە

﴿ A- رەگی کار + پاشگر B- رەگی کار + ناو C- قەدی چاوگ + پاشگر D- ناو + ناو ﴾

١٢- ( ب دەستێن لەرزۆك ژینا خۆ نەبورینە ) وشەی ( لەرزۆك ) ئەرکی بریتییە لە

﴿ A- تەواوکەری بە یاریدە B- بکەر C- بەرکار D- دیارخەری ناو ﴾

١٣- ( جگەرە کێشان کوشندەیە ) وشەی ( کوشندە ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- نیهاد B- تەواوکەری کاری ناتەواو C- دیارخەری ناو D- بکەر ﴾

١٤- ( مرۆڤی نفستی ها یی ژ خۆ نینە ) وشەی ( نفستی ) ئەرکی دەبێتە

﴿ A- دیارخەری ناو B- بکەر C- نیهاد D- تەواوکەری بەیاریدە ﴾

١٥- یەکێك لەم پاشگرانە کە دەچێتە سەر ( ناوی واتایی ) جۆرە زیادە رۆییەك لە کار و سیفەتی هاوەڵناوەکەدا دروست دەکا.

﴿ A- ناك B-ا C-ەر D-کار ﴾

١٦- یەکێك لەم پاشگرانە کە دەچێتە سەر ( ناوی واتایی ) جۆرە زیادە ڕۆیییەك لە کار و سیفەتی هاوەڵناوەکەدا دروست دەکا .

﴿A- مەند B-ا C-ەر D-گەر﴾

١٧- یەکێك لەم پاشگرانە کە دەچێتە سەر ( ناوی بەرجەستە ) نایکاتە هاوەڵناوی بکەری دارژاو بەڵکو دەیکاتە ناوی ( پیشە ).

﴿A- وەر B- ا C- ەر D- گەر﴾

١٨- هاوەڵناوی بکەری دارێژراو وەك ( ناو ) ڕەفتار دەکات ئەگەر

﴿A- بدرێتە پاڵ ناو B- بدرێتە پاڵ جێناو C-ببێتە تەواوکەری کاری ناتەواو D-نەدرێتە پاڵ ناو﴾

١٩- هاوەڵناوی ( بخۆر ) لە ڕووی پێکهاتنەوە پێك دێت لە

A- پێشگر+ ڕەگی کار+ پاشگر(ر) B- پێشگر+ ڕەگی کار+ پاشگر(ەر) C- پێشگر+ ڕەگی کار D- پێشگر+ قەدی چاوگ + پاشگر(ر)

٢٠- یەکێك لەم پاشگرانە کە دەچێتە سەر ( ناوی واتایی ) هاوەڵناوی بکەری دارێژراو دروست دەکات و هاوەڵناوەکە واتای ناخۆشی لێ بەدی دەکرێت. ﴿A- بار B- وەر C- ەر D- ناك﴾

٢١- هاوەڵناوی بکەری دارێژراوی ( بخۆر ) لەکام لەم چاوگانە دروستکراوە

﴿A- خوران B- خوێندن C- خواردن D- خستن﴾

٢٢- کام لەم هاوەڵناوە بکەری دارێژراوانە لەچاوگی ( تێکردن ) دروستکراوە

﴿A- تێکراو B- تێکەر C- تێکدەر D- تێکدراو﴾

٢٣- کام لەم هاوەڵناوە بکەری دارێژراو سیفەتەکەی موبالەغە و زێدەڕۆیی تێدایە

﴿A- گەڕۆك B- کوشندە C- نەبەز D- ستەمگەر﴾

٢٤- کام لەم هاوەڵناوە بکەری دارێژراوانە ( پێشگر + ڕەگی کار )

﴿A- بسۆت B- بەزیو C- بکەر D- نەخۆر﴾

---

ئامادەکردنی م. عومەر ئەحمەد خدر ئامادەیی ئازادیی کوڕان و ئامادەیی زانیاریی ئەهلی



# هاوەڵناوی بکەری لێکدراو

هاوەڵناوی بکەری لێکدراو: وشەیەکە سیفەتێکی هەمیشەیی و توانایەکی تایبەتی بە هەڵگرەکەی دەبەخشێ ئەم جۆرە هاوەڵناوانە سیفەتی بکەریان هەیە.

ڕێگاکانی دروستکردنی هاوەڵناوی بکەری لێکدراو:

١) ناو + ڕەگی کار ﴿ پیاوکوژ، خواپەرست، هەواڵگر، دەرمانفرۆش، وێنەگر، خوێن مژ ...﴾ مرۆڤی خواپەرست دەچێتە بەهەشت.

٢) هاوەڵناو + ڕەگی کار ﴿ خۆشنووس، گەشبین، تیژڕۆ، ڕەشپۆش، کەچ بین... ﴾ مرۆڤی گەشبین دەروونی فراوانە.

٣) هاوەڵکار + ڕەگی کار ﴿ پێش ڕۆ، کەم دوێ، زۆر وەڕ ... ﴾ ئەم منداڵە کەم دوێ یە.

٤) هاوەڵکار + ڕەگی کار+ پاشگر ﴿ زۆرخۆر، کەم خۆر ... ﴾ منداڵی کەم خۆر لاوازە.

٥) ناو + ڕەگی کار + پێشگر / پاشگر ﴿ نوێژکەر، خەباتکەر، ئیشکەر، نانکەر، نانبدە ... ﴾ مرۆڤی ئیشکەر خۆشەویستە.

٦) جێناوی خۆیی + ڕەگی کار ﴿ خۆکوژ، خۆراگر، خۆهەڵکێش، خۆناس، خۆبین.... ﴾ مرۆڤی خۆراگر بە ئامانج دەگات.

٧) جێناوی خۆیی + ڕەگی کار+ پاشگر ﴿ خۆخۆر - خۆسەپێنەر ﴾ گەلی خۆخۆر بە ئاوات ناگات.

٨) ناو یان جێناوی خۆیی + قەدی چاوگی تێپەر ﴿ دەستکرد ، خۆکرد ، خۆ ویست ... ﴾ کڵاشی دەستکرد جوانە.

٩) ناو+ قەدی چاوگی تێپەر+ پاشگر(وو - ی - ە) ﴿ نانبردوو، نانبردی، کارکردوو، کۆچکردوو... ﴾ کەسی کارکردوو ماندووە.

---

تێبینی/ هاوەڵناوی بکەری لێکدراو ئەگەر نەدرێتە پاڵ ناوێك یان وەسفی ناو نەکات ئەو کاتە هەموو تایبەتیەکانی ناو وەردەگرێت و پێی دەوترێت ناوی بکەر.

أ- دەکرێ کۆ بکرێتەوە — خواپەرستان لە پەرستگاکاندا دەژین.

ب- وەکو ناو دەبێتە ناسراو و نەناسراو — دەرمانفرۆشەکە کۆمەڵێك دەرمانی فرێدا.
دەرمانفرۆشێك لە ڕێگا توشم بوو.

ج- هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێ

١- بکەر ← وێنەگرەکە دوو وێنەی بۆ گرتین.
٢- بەرکار ← من وێنەگر لە ئاهەنگا نەورۆزێ دیت.
٣- نیهاد ← وێنەگرەکە شارەزایە.
٤- گوزارە( تەواوکەری کاری ناتەواو ← ئەمە وێنەگرەکەیە.
٥- تەواوکەری بە یاریدە ← دێ ئەڤ وێنەی ژ وێنەگری کرم.
٦- دیارخەری ناو ← وێنەی وێنەگرەکە زۆر کاڵ بوو.
٧- جێگری بکەر ← وێنەگرەکە بینرا.

---

## راهێنانی (١) لا ٥٥

| دێر | ها.بکەری لێکدراو | دەستوری دروست بوون |
|---|---|---|
| ١ | پێشڕەو | هاوەلکار( پێش ) + رەگی کار( ڕەو ) |
| ٢ | شین پۆش | هاوەلناو( شین ) + رەگی کار ( پۆش ) |
| ٣ | مەی فرۆش | ناو( مەی ) + رەگی کار( فرۆش ) |
| ٤ | بەدگۆ | هاوەلناو( بەد ) + رەگی کار( گۆ ) |

## راهێنانی (٢) لا٥٦

١. هاوەلناوی بکەری دارێژراو به زۆری لەچاوگ دێتە دروست کردن به هۆی پێشگرو پاشگرەوە واتا پێك دێت له وشەیەکی واتادارو پاشگرێك یان پێشگرێك یان پێشگرو پاشگرێك. نووسەر - نەمر - نەخۆر

هاوەلناوی بکەری لێکدراو له دوو وشەی واتادار یان زیاتر پێك دێت (رەگی کار) رۆلی گرنگ دەبینێ له دروست کردنی.
خوێنمژ - خۆشنووس - زۆرخۆر - کەم دوێ - خەباتکەر

٢. هاوەلناوی بکەری لێکدراو له ناو رستەدا وەکو ناو بەکار دێ ئەگەر نەدرێتە پال ناوێك یان جێناوێك وەسفی ناو نەکات وە هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێت ..........................

## راهێنانی (٣) لا ٥٦

| دێر | وشە | جۆر | چۆنیەتی دروست بوون | ئەرك |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کیم پرس | ها.بکەری لێکدراو | هاوەلناو( کیم ) + رەگی کار( پرس ) | دیارخەری ناوی ( مرۆڤ )ە. |
| ٢ | ستەمکار | ها.بکەری دارێژراو | ناوی واتایی (ستەم ) + پاشگر ( کار ) | دیارخەری ناو ( چەرخ )ە. |
| ٣ | دلدۆز | ها.بکەری لێکدراو | ناو( دل ) + رەگی کار( دۆز ) | دیارخەری ناوی ( تیر )ە. |
| ٤ | کۆستکەوتوو | ها.بکەری لێکدراو | ناو( کۆست ) + قەد ( کەوت ) + پاشگر( وو ) | دیارخەری ناوی ( مرۆڤ )ە. |
| ٥ | لەخوانەترس | ها.بکەری لێکدراو | گرێی ناو( لەخوا ) +نا.نەرێ( نە )+رەگی کار( ترس ) | دیارخەری ناوی ( زالم )ە. |
| ٦ | عاشقکوژ | ها.بکەری لێکدراو | ناو( عاشق ) + رەگی کار( کوژ ) | دیارخەری ناوی ( قاتل )ە. |

## راهێنانی (٤) لا ٥٧

نووسین ← خۆشنووس ← بەرکار: خۆشنووسەکەم بینی.
ت.بە یاریدە: چیرۆکەکەم له خۆشنووسەکە وەرگرت.
فرۆشتن ← رۆژنامەفرۆش ← بەرکار : رۆژنامەفرۆشەکەیان گرت.
ت.بە یاریدە: گۆڤارەکەم له رۆژنامەفرۆشەکە کری.

## راهێنانی (٦) لا ٥٧

| چاوگ | ها.بکەری لێکدراو | چۆنیەتی دروست کردن |
|---|---|---|
| کوشتن | پیاوکوژ | ناو( پیاو ) + رەگی کار( کوژ ) |
| مالین | بەفرمال | ناو( بەفر ) + رەگی کار( مال ) |
| کێشان | جگەرە کێش | ناو( جگەرە ) + رەگی کار( کێش ) |
| بردن | نان بردە | ناو( نان ) + قەدی چاوگ( برد ) + پاشگر( ە ) |

# هاوەڵناوی بکەری لێکدراو

١- هاوەڵناوی ( خوێنمژ ) پێك هاتووە لە
﴿ A- قەدی چاوگ + پاشگر    B- ناو + رەگی کار    C- ناو + پاشگر    D- رەگی کار + رەگی کار ﴾

٢- ( مرۆڤی ئیشکەر خۆشەویستە ) هاوەڵناوی ( ئیشکەر ) پێك هاتووە لە
﴿ A- ناو + رەگی کار + پاشگر    B- ناو + ناو    C- ناو + رەگی کار    D- ناو + قەدی چاوگ ﴾

٣- ( کڵاشی دەستکرد جوانە ) هاوەڵناوی ( دەستکرد ) ئەرکی دەبینێتە
﴿ A- نیهاد    B- بکەر    C- دیارخەری ناو    D- بەرکار ﴾

٤- ( خواپەرستان لە پەرستگاکان دەژین ) وشەی ( خواپەرستان ) بریتیە لە
﴿ A- ناو    B- هاوەڵناوی بکەری دارژاو    C- چاوگ    D- کار ﴾ە.

٥- ( مرۆڤی کەم دوێ رەوشت بەرزە ) وشەی ( کەم دوێ ) بریتیە لە
﴿ A- هاوەڵناوی بکەری دارژاو    ب - هاوەڵناوی بکەری لێکدراو    C- ناوی لێکدراو    D- ناوی دارێژراو ﴾

٦- ( پێشمەرگە خەباتکەرەکە شەهید بوو ) هاوەڵناوی ( خەباتکەر ) پێك دێت لە
﴿ A- ناو+ ناو    B- هاوەڵناو + پاشگر    C- ناو + رەگی کار + پاشگر    D- هاوەڵناو + ناو ﴾

٧- هاوەڵناوی بکەری لێکدراو وەکو ( ناو ) رەفتار دەکات ئەگەر
﴿ A- بدرێتە پاڵ ناو    B- بدرێتە پاڵ جێناو    C- ببێتە تەواوکەری کاری ناتەواو    D- نەدرێتە پاڵ ناو ﴾

٨- ( ئەم کورە خۆشنووسە ) هاوەڵناوی ( خۆشنووس ) ئەرکی دەبینێتە
﴿ A- بەرکار    B- نیهاد    C- تەواوکەری کاری ناتەواو    D- بکەر ﴾

٩- ( مرۆڤی کێم پرس زوو تشتی فێر نابیت ) گرێی ( مرۆڤی کێم پرس ) ئەرکی دەبینێتە
﴿ A- بکەر    B- بەرکار    C- دیارخەری ناو    D- نیهاد ﴾

١٠- ( ئەمە کامیرای وێنەگرەکە بوو ) ( وێنەگر ) ئەرکی دەبینێتە
﴿ A- تەواوکەری کاری ناتەواو    B- نیهاد    C- دیارخەری ناو    D- بەرکار ﴾

١١- وشەی ( پێشڕۆ ) بریتیە لەهاوەڵناوی ﴿ A- بکەری دارژاو    B- بکەری لێکدراو    C-چۆنیەتی    D- نادیار ﴾

١٢- ( گەلی خەباتکەر بە ئامانج دەگات ) هاوەڵناوی ( خەباتکەر ) پێك هاتووە لە
﴿ A- ناو + قەدی چاوگ    B- ناو + ناو    C- ناو + رەگی کار    D- ناو + رەگی کار + پاشگر ﴾

١٣- ( وێنەگرەکەیان گرت ) وشەی ( وێنەگر ) بریتیە لە
﴿ A- هاوەڵناوی بکەری دارژاو    B- هاوەڵناوی بکەری لێکدراو    C- ناوی بکەری لێکدراو    D- ناوی بکەری دارێژراو ﴾

١٤- کام لەم هاوەڵناوە بکەریە لێکدراوانە پێکهاتووە لە ( ناو + رەگی کار + پاشگر )
﴿ A- کەمخۆر    B- نانخۆر    C- نانبردە    D- خۆخۆر ﴾

١٥- کام لەم هاوەڵناوە بکەرییە لێکدراوانە پێکهاتووە لە ( هاوەڵناو + رەگی کار )
﴿ A- کەچ بین    B- کەم دوێ    C- زۆرخۆر    D- زۆروەڕ ﴾

١٦- کام لەم هاوەڵناوە بکەریە لێکدراوانە بەم دەستوورە ( جێناوی خۆیی + رەگی کار + پاشگر ) دروستبووە ؟
﴿ A- خۆسەپێنەر    B- خۆهەڵکێش    C- خۆکوژ    D- خۆراگر ﴾

نوسینگەی ماردین
بەرامبەر پەروەردەی کشتی هەولێر
07507977770
marden office

# ئەدەبی کـــوردی

## کۆرسی یەکەم

## پـــۆلـی یازدەهـــەمـی ئامادەیـــی

| ناوەرۆک | |
|---|---|
| | * ئەدەب بەشێوەی پرسیار و وەڵام |
| | * ( ١٩٠ ) پرسیار بە شێوەی هەڵبژاردن بۆ سەرجەم بابەتەکانی ئەدەب |

ئامادەکردنی مامۆستا :

عـــومـــەر ئـــەحـــمـــەد خـــدر

ئامادەیی ئازادیی کـوڕان
ئامادەیی زانیاریی ئەهلی

نوسینگەی ماردین
بەرامبەر پەروەردەی کشتی هەولێر
07507977770
marden office

# ڕێبازە ئەدەبییەکان

## ڕێبازی ڕۆمانتیکی

پ١ / ڕێبازی ڕۆمانتیك لەکوێ و کەی سەری هەڵدا ؟ چۆن بوو ؟

و / ڕێبازی ڕۆمانتیك لە ئەوروپا نزیکەی سەدە و نیوێك دوای دەرکەوتنی ڕێبازی کلاسیزم سەری هەڵدا ، ئەم ڕێبازە تازەیە شۆڕشێك بوو دژی هەموو دەستوور و بنەما دەفکرتووەکانی ڕێبازی کلاسیزم ، شۆڕشێك بوو بۆ ڕزگارکردنی ئەدەب و هونەر لەژێر دەسەڵاتی داسەپاوی ئەدەبیاتی گریکی و لاتینی کۆن.

پ٢ / پێناسەی ( ڕێبازی ڕۆمانتیك ) بکە

و / ڕێبازی ڕۆمانتیك ئازادکردنی حەز و ئارەزوو و ڕەهاکردنی سۆز و مەگێزەکانی مرۆڤە ، جلەو بەردانی فریشتەی ئەدەب و هونەرە ، کردنەوەی جیهانی بێ سنوورە بۆ پەروازەبوونی سۆز و گیان.

پ٣ / وشەی ( ڕۆمانتیك ) لەچی هاتووە ؟ بەچی دەوترا ؟

و / ١- وشەی ( ڕۆمانتیك ) لە وشەی ( ڕۆمانیوس ) ەوە هاتووە کەبەو زمانانە دەگوترا کە لە لاتینی کەوتبوونەوە و لەسەدەکانی ناوەڕاست بەزاری ڕەمەکی ( عام ) دادەنران و لەسەرەتای چاخی ژیانەوەدا ( ڕێنسانس ) وردە وردە بوون بە زمانی نووسین و جێگای زمانی لاتینیان گرتەوە.

٢- وشەی ( ڕۆمانتیك ) لە وشەی ( ڕۆمانس ) ەوە کە لەسەدەکانی ناوەڕاست بە چیرۆکی خەیاڵی و پاشان سوارچاکی دەگوترا کە بە شیعر بووبێ یان بە پەخشان.

پ٤ / بۆچی ڕۆمانتیکییەکان وشەی ( ڕۆمانیوس ) یان بەکارهێناوە بۆ ڕێبازەکەیان ؟

و / ڕۆمانتیکییەکان کە ئە وشەیان بۆ ڕێبازەکەیان دانا مەبەستیان ئەوەبوو مێژوو ، ئەدەب و کلتووری نەتەوایەتی خۆیان لەوانەی گریك و لاتینی جودا بکەنەوە کە بەسەر کلاسیزمدا زاڵ ببوو.

پ٥ / ( ڕۆمانس ) پەیوەندی بە چ هەبوو ؟ چەند لق بوو ؟

و / ڕۆمانس پەیوەندی بە ئۆرستوکراتەکانەوە هەبوو. دواتر دوو لقی لێ جودا بووەوە ( ڕۆمانسی ئورستوکراتی ) و ( ڕۆمانسی میللی )

### سەردەمی دەرکەوتنی ڕێبازی ڕێبازی ڕۆمانتیك

پ٦ / ڕۆمانتیك لە کوێ دەرکەوت ؟ بۆ یەکەمجار کێ وەکو ڕێبازی ئەدەبی دژی کلاسیك پەیرەوی کرد ؟

و/ ڕیبازی ڕۆمانتیك لە ئەوروپا دەرکەوتووە ، بۆ یەکەمجار ( فردریك شلیگل )ی ئەڵمانی ڕۆمانتیکی وەکو ڕێبازێکی ئەدەبی دژی کلاسیزم پەیرەوکرد.

پ٧/ کێ لە ژێر کاریگەری ( فردریك شلیگل ) ی ئەڵمانی لە فەرەنسا بانگەشەی بۆ ڕێبازی ڕۆمانتیك کرد ؟ کوێ مەڵبەندی چەسپاندن و بڵاو بوونەوەی ڕێبازەکە بوو ؟

و/ ( مادام دوستایل ) لە ژێر کاریگەری ئەوەوە بانگەشەی بۆدا. فەرەنسا مەڵبەندی چەسپاندن و بڵاو بوونەوەی ڕێبازەکە بوو.

پ٨/ ماوەی ساڵانی چەند بە خۆگرتن و پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی ڕیبازی ڕۆمانتیك دادەندرێت ؟

و/ ساڵانی ( ١٨٠٠- ١٨٣٠ ) ز بە خۆگرتن و پەرەسەندنی ئەو ڕێبازە دادەندرێت.

پ٩/ کێ دەوری سەرەکی هەبوو لە چەسپاندنی ڕێبازی ڕۆمانتیك باسی بکە ؟

و/ ( فکتۆر هۆگۆ ) دەوری سەرەکی هەبووە لە چەسپاندنی ڕێبازی ڕۆمانتیك لە ساڵی ١٩٢٧ شانۆگەری ( کرۆمۆیل ) ی بڵاو کردەوە لە پێشەکیدا باسی گەشەسەندنی شیعر دەکا لە مێژووی مرۆڤایەتی و دەیکا بە شیعری لیریکی و شیعری ئیپیکی و شیعری درامیتیکی ئەم پێشەکییە وەکو بەیاننامەو ئینجیلی ڕۆمانتیکی وابوو.

# ڕێبازە ئەدەبییەکان

١- ڕێبازی ڕۆمانتیک لەکوێ سەری هەڵدا ؟ A- ئەوروپا B- ئەمریکا C- ئاسیا D- ئەفریقیا

٢- ڕێبازی ڕۆمانتیک شۆڕشێک بوو دژی هەموو دەستوور و بنەما دەقگرتووەکانی ڕێبازی :

A- کلاسیزم B- ڕۆمانتیزم C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

٣- کام ڕێباز ( شۆڕشێک بوو بۆ ڕزگارکردنی ئەدەب و هونەر لەژێر دەسەڵاتی داسەپاوی ئەدەبیاتی گریکی و لاتینی کۆن. )

A- کلاسیک B- ڕۆمانتیک C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

٤- ( ئازادکردنی حەز و ئارەزوو و ڕەهاکردنی سۆز و مەگێزەکانی مرۆڤە ، جڵەو بەردانی فریشتەی ئەدەب و هونەرە. ) لەڕێبازی

A- کلاسیک B- ڕۆمانتیک C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

٥- وشەی ( ڕۆمانتیک ) لەچی هاتووە ؟ A- ڕۆمان B- ڕۆما C- ڕۆمانیوس D- ڕۆمیۆ

٦- وشەی ( ڕۆمانتیک ) لەچی هاتووە ؟ A- ڕۆماس B- ڕۆمان C- ڕۆمای D- ڕۆمانس

٧- کێ بۆ یەکەمجار ڕۆمانتیکی وەکو ڕێبازی ئەدەبی دژی کلاسیک پەیرەوی کرد؟

A- مادام دوستایل B- فردریک شلیگل C- ڤکتۆر هۆگۆ D- بوالۆ

٨- یەکەمجار ( فردریک شلیگل ) ی ئەڵمانی ڕۆمانتیکی وەکو ڕێبازی ئەدەبی دژی چ ڕێبازێک پەیرەوی کرد؟

A- کلاسیزم B- ڕۆمانتیزم C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

٩- کێ لە ژێر کاریگەری ( فردیک شلیگل ) ی ئەڵمانی لە فەرەنسا بانگەشەی بۆ ڕێبازی ڕۆمانتیک کرد؟

A- مادام دوستایل B- شکسپیر C- ڤکتۆر هۆگۆ D- بوالۆ

١٠- کوێ مەڵبەندی چەسپاندن و بڵاوبوونەوەی ڕێبازی ڕۆمانتیک بوو ؟

A- ئیتاڵیا B- ئەڵمانیا C- بەریتانیا D- فەرەنسا

١١- ماوەی ساڵانی چەند بە خۆگرتن و پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی ڕێبازی ڕۆمانتیک دادەندرێت ؟

A- (١٨٢٠ - ١٨٣٠) ز B- (١٨٠٠ - ١٨٣٠) ز C- (١٨٠٠ - ١٨٥٠) ز D- (١٨٢٠ - ١٨٥٠) ز

١٢- کێ دەوری سەرەکی هەبوو لە چەسپاندنی ڕێبازی ڕۆمانتیک باسی بکە ؟

A- مادام دوستایل B- فردریک شلیگل C- ڤکتۆر هۆگۆ D- بوالۆ

١٣- شانۆگەری ( کرۆمۆیل ) لە نووسینی کێ بوو ؟

A- مادام دوستایل B- فردریک شلیگل C- ڤکتۆر هۆگۆ D- بوالۆ

١٤- ( کرۆمۆیل ) چ جۆرە بەرهەمێکی ئەدەبییە ؟ A- ڕۆمان B- شیعر C- وتار D- شانۆگەری

١٥- ( ڤکتۆر هۆگۆ ) شانۆگەری ( کرۆمۆیل ) ی ساڵی چەند بڵاوکردەوە ؟ A- ١٩١٧ز B- ١٩٢٧ز C- ١٩٣٧ز D- ١٩٢٠ز

١٦- ( ڤکتۆر هۆگۆ ) لە پێشەکی شانۆگەری ( کرۆمۆیل ) دا باسی گەشەسەندنی کام لەمانە دەکات ؟

A- شیعر B- پەخشان C- شانۆگەری D- وتار

پ١٠/ خاسیەتەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی بژمێرە ؟

و/١. ڕۆمانتیك دەسەڵاتی عەقڵ بەلاوە دەنێ بایەخ بە ئازادکردنی هەست و سۆز دەدا.

٢. ڕۆمانتیك گەڕانەوەیە بۆ باوەشی سروشتی کپ و هێمن شاعیر بە سروشت هەڵدەڵێ و حەزدەکا بە گۆشەگیری تێکەڵی سروشت بێ.

٣. ڕۆمانتیك باوەڕی بە ئازادی هەیە بۆ دەربڕینی هەست و سۆزو جۆشی ناوەوە گوێ بە هیچ دەستوور و قالبێکی چەسپاو نادات.

٤. ڕۆمانتیك بایەخ بە تاك (من) ی شاعیر و تاقیکردنەوەی تایبەتی دەدا.

٥. ڕۆمانتیك لە بایەخدانی بە کات و شوێندا توشی نامۆیی دەبێ لەگەڵ سەردەم و شوێنی خۆی ناگونجێ بە خەیاڵ بەرەو ڕابردوو دەگەڕێتەوە.

٦. ڕۆمانتیك و نەخۆشی سەردەم. ڕۆمانتیکیەکان هیواو ئاواتیان زۆر بوو بەڵام توانای هێنانە دی ئەو ئاواتانەیان نەبوو.

٧. مۆرکی ناوچەیی: ڕۆمانتیك کە باسی مرۆڤ دەکا وەکو شتێکی گشتی باسی ناکا کە باسی هەست و سۆز دەکا وەکو شتێکی گشتی باسی ناکا، بەلکو هەر مرۆڤێك و هەست و سۆزێك مۆرکی تایبەتی خۆی وەردەگرێ.

٨. ئەندێشەی داهێنەرانە. لای ڕۆمانتیکیەکان ئەدەب بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لاساکردنەوەی سروشت و ژیانە (خەلقە).

٩. بابەتی ئەدەبی ڕۆمانتیك. ڕۆمانتیکی ئەورو پی بابەتەکانی تەقلیدی نین دەتوانێ هەر شتێ بکاتە بابەتی نووسین وەکو دیمەنەکانی سروشت، میژووی نەتەوایەتی، بابەتی ناوچەیی.

١٠. ڕۆمانتیك لە دەربڕیندا پەنا دەباتە بەر هەندێ سیمای تایبەتی وەك: ڕزگار بوون لە دەستوور و یاسا، ئاڵۆزی، تێکەڵ کردنی هەستەکان.

## خاسیەتەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیك

١- یەکێك لە خاسیەتەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیك بریتیە لە بایەخ بە ئازادکردنی

A- نیشتمان B- عەقڵ C- هەست و سۆز D- کۆیلە

٢- (گەڕانەوەیە بۆ باوەشی سروشتی کپ و هێمن) یەکێك لە خاسیەتەکانی ڕێبازی

A- کلاسیك B- ڕۆمانتیك C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

٣- (بایەخ بە تاك (من) ی شاعیر و تاقیکردنەوەی تایبەتی دەدا) یەکێك لە خاسیەتەکانی ڕێبازی

A- کلاسیك B- ڕۆمانتیك C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

٤- ڕۆمانتیك لە بایەخدانی بە کات و شوێندا توشی چی دەبێت ؟

A- ورەبەرزی B- لەخۆبایی بوون C- گەورەیی D- نامۆیی

٥- کام ڕێباز لە بایەخدانی بە کات و شوێندا توشی نامۆیی دەبێت ؟

A- کلاسیك B- ڕۆمانتیك C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

٦- هیواو ئاواتیان زۆر بوو بەڵام توانای هێنانە دی ئەو ئاواتانەیان نەبوو.

A- کلاسیکییەکان B- ڕۆمانتیکییەکان C- ڕیالیزمییەکان D- فۆرمالیزمییەکان

٧- (ئەدەب بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لاساکردنەوەی سروشت و ژیانە (خەلقە) ئەمە لای :

A- کلاسیکییەکان B- ڕۆمانتیکییەکان C- ڕیالیزمییەکان D- فۆرمالیزمییەکان

٨- (پەنا بردنە بەر هەندێ سیمای تایبەتی وەك: ڕزگار بوون لە دەستوور و یاسا، ئاڵۆزی، تێکەڵکردنی هەستەکان.) یەکێکە لە خاسیەتەکانی: A- کلاسیك B- ڕۆمانتیك C- ڕیالیزم D- فۆرمالیزم

پ١١/ رۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا زیاتر لە چیدا دەردەکەوێت ؟ بە شێوەیەکی زەق کەی رەگەزەکانی رۆمانتیك گەڵاڵە بوون ؟

و/ رۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا زیاتر لە شیعردا دەردەکەوێ تا جۆرەکانی تری ئەدەب. بە شێوەیەکی زەق ئەو رەگەزانە لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم گەڵاڵە بوون.

پ١٢/ بۆ گەڵاڵە بوونی رەگەزەکانی رۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا چ کاریگەریەك هەبوو ؟

و/ جگە لەکاریگەری ناوەوە کاریگەری دەرەوەشی بەسەرەوە هەبوو شیعری نەتەوە دراوسێکان بە تایبەتی شیعری تورکی کاریگەری زۆری کردبووە سەر ئەو جوڵانەوە تازەگەرییە لەگەڵاڵە بووندا، جگە لەکاریگەری شیعری ئەوروپی چ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بێ لەرێی شیعری تورکی چ بە شێوەیەکی راستەوخۆ بێ کاری زۆری کردبووە سەر گورپێدانی جوڵانەوەی تازەگەری شیعری کوردی.

پ١٣/ رۆمانتیك شۆرش بوو دژی دەستوور و بنەماکانی رێبازی کلاسیزم پێشەنگەکانی ئەم نوێ خوازییە کێ بوون ؟

و/ پێشەنگانی ئەم نوێ خوازییە بریتی بوون لە ( شێخ نوری شێخ سالح و رەشید نەجیب و گۆران و پیرەمێرد ) کە هەموویان کاریگەری شیعری ئەوروپی و تورکییان زەق پێوە دیار بوو.

## بنەماکانی رۆمانتیك لە شیعری کوردیدا

١. پشت کردنە کێشی عەرووزی کە شیعری کلاسیزمی پێ نووسراوە و گەڕانەوە بۆ کێشی ژمارەیی ( برگەیی - پە نجەیی - خۆماڵی ) کە کێشێکی رەسەنی کوردییە، هەموو شیعری فۆلکلۆری و زۆربەی هەرە زۆری شیعری زاری گۆران و لوڕ بەو کێشە نووسراوە.

٢. وازهێنان لە یەکێتی سەروا و بەکارهێنانی سەروای مەسنەوی یان رەنگاو رەنگ.

٣. یەکێتی بابەت لە شیعری رۆمانتیکدا بەسەر هەموو هۆنراوەکەدا دابەش دەبێ.

٤. بەکارهێنانی زمانێکی سادەو ئاسان کە هەموو کەس تێی بگا نەك کۆمەڵکی دەستەبژێر ( نخبە ) وشەکانی هەموو کوردی پەتین و بە پێی توانا شاعیر خۆی لە بەکارهێنانی وشەی عەرەبی و فارسی و تورکی قورس دوور دەخاتەوە

٥. شاعیر بە پێی توانا خۆی لە هونەرە رەوانبێژییە تەقلیدییەکان لادەداو بەدوای لێکچواندن و خوازەو هونەری جوانکاری تازەدا دەگەرێ.

٦. شاعیر جگە لەوەی بە زمانێکی سادەو ئاسان دەنووسێ کە هەموو کەس تێی بگا، نووسینەکەشی بۆ هەموو کەسەو لە پێناوی رەشەوەندی خەڵکەکە دەنووسێ و نووسینەکەی خزمەتی چینە زۆر لێکراوو قوربانییەکانی کۆمەڵ دەکا.

٧. گەڕانەوە بۆ سروشت و گەڕان بە دوای جوانی لە دیمەنەکانی سروشت و خەم خواردن بۆ دیمەنە جەرگبڕەکان وەك وەرینی گەڵای دارێك و خشینی ئەستێرەیەك و ئاوابوونی مانگ و خۆر.

٨. خۆشەویستیەکی پاك و بێگەرد و زۆرجار نائومێدبوون لە ژیان و دوارۆژ بەچاوی رەشبینانە و گۆشەگیری و خۆ دوورخستنەوە لە خەڵك.

٩. تاکێتی ( زاتیەت ) و باسکردنی دەرد و ئازاری تایبەتی و خۆ دوورخستنەوە لە بابەت و هەست و سۆزی گشتی و عەوداڵبوون.

١٠. رابردوو دەبێتە مەیدانێکی فراوان ، ئەندێشەی شاعیر دەگەرێتەوە سەری بابەتی ئەدەبی و دیمەنی گەش و جوانی لێ وەردەگرێ.

١١. سوود وەرگرتن لە کەلتور و ئەدەبی میللی بە هەموو کەرەستەی زمان و بابەتی ئەدەبییەوە بۆ نووسینی بەرهەمی وا کە گیانی میللی و نەتەوایەتی و نیشتیمانی تێدا بدرەوشێتەوە.

---

ئامادەکردنی م. عومەر ئەحمەد خدر

ئامادەیی ئازادیی کوڕان و ئامادەیی زانیاریی ئەهلی



## رۆمانتیک لەئەدەبی کوردیدا

١- رۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا زیاتر لە کام لەمانە دەردەکەوێت ؟ A- رۆمان B- شیعر C- وتار D- شانۆگەری

٢- لە ئەدەبی کوردیدا بە شێوەیەکی زەق رەگەزەکانی رۆمانتیك گەڵاڵەبوون لە نیوەی:

A- یەکەمی سەدەی نۆزدەم B- یەکەمی سەدەی بیستەم C- دووەمی سەدەی نۆزدەم D- دووەمی سەدەی بیستەم

٣- یەکێ لە پێشەنگەکانی رێبازی رۆمانتیکی کوردی بریتییەلە: A- شێخ نووری شێخ ساڵح B- هێمن C- هەژار D- نالی

٤- یەکێ لە پێشەنگەکانی رێبازی رۆمانتیکی کوردی بریتییەلە: A- سالم B- کوردی C- رەشید نەجیب D- نالی

٥- یەکێ لە پێشەنگەکانی رێبازی رۆمانتیکی کوردی بریتییەلە: A- مەلای جزیری B- گۆران C- خانی D- حاجی قادر

٦- یەکێ لە پێشەنگەکانی رێبازی رۆمانتیکی کوردی بریتییەلە: A- کوردی B- خالی C- سالم D- پیرەمێرد

## بنەماکانی رۆمانتیک لەئەدەبی کوردیدا

١- شاعیرانی رۆمانتیکی کوردی چ کێشێکیان لە شیعرەکانیاندا بەکارهێناوە ؟

A- عەرووزی عەرەبی B- برگەیی C- ئازاد D- هیچیان

٢- یەکێك لەبنەماکانی رێبازی رۆمانتیك لەشیعری کوردیدا پشتکردنە لە کێشی

A- عەرووزی عەرەبی B- برگەیی C- پەنجەیی D- خۆماڵی

٣- هەموو شیعری فۆلکلۆری و زۆربەی هەرە زۆری شیعری زاری گۆران و لوڕ بە چ کێشێك نووسراوە ؟

A- عەرووزی عەرەبی B- برگەیی C- ئازاد D- سەربەست

٤- یەکێك لەبنەماکانی رێبازی رۆمانتیك لەشیعری کوردیدا وازهێنانە لەبەکارهێنانی :

A- یەکیەتی سەروا B- سەروای مەسنەوی C- سەروای رەنگاوڕەنگ D- سەروای بەنۆرە

٥- یەکێك لەبنەماکانی رێبازی رۆمانتیك لەشیعری کوردیدا بریتییەلە پەیڕەوکردن و بەکارهێنانی :

A- یەکیەتی سەروا B- سەروای مەسنەوی C- سەروای ئازاد D- کێشی خۆماڵی

٦- یەکێك لەبنەماکانی رێبازی رۆمانتیك لەشیعری کوردیدا بریتییەلە پەیڕەوکردن و بەکارهێنانی :

A- یەکیەتی سەروا B- سەروای رەنگاوڕەنگ C- سەروای ئازاد D- سەروای بەنۆرە

٧- یەکێك لەبنەماکانی رێبازی رۆمانتیك لەشیعری کوردیدا بریتییەلە:

A- بەکارهێنانی کێشی عەرووزی عەرەبی. B- یەکێتی بابەت لە شیعری رۆمانتیکدا بەسەر تاکە دێرەکاندا دابەش دەبێ

C- بەکارهێنانی یەکیەتی سەروا D- یەکێتی بابەت لە شیعری رۆمانتیکدا بەسەر هەموو هۆنراوەکەدا دابەش دەبێ

٨- ( لە شیعری رۆمانتیکدا بەسەر هەموو هۆنراوەکەدا دابەش دەبێ ) ئەمە چی دەگەیەنێت ؟

A- رەوانبێژی B- وشەکاری C- وشەی بێگانە D- یەکێتی بابەت

٩- یەکێك لەبنەماکانی رێبازی رۆمانتیك لەشیعری کوردیدا بریتییەلە بەکارهێنانی :

A- زمانێکی ئاڵۆز B- زمانێکی وردوچڕ C- زمانێکی سادە و ئاسان D- زمانێکی تێکەڵ

١٠- لەرۆمانتیکی کوردیدا شاعیر نووسینەکەی بۆ کێیە ؟

A- نوخبەیەکی دیاریکراو B- هەموو کەس C- خودی خۆی D- هەر سێکیان

١١- شاعیرانی کام رێبازی ئەدەبی توشی نائومێدی و رەشبینی دەبن ؟ A- کلاسیك B- رۆمانتیك C- ریالیزم D- فۆرمالیزم

پ١/ لە شێوەی كرمانجی خوارووا سەرەتای تازەكردنەوەی شیعری كوردی كەی دەست پێ دەكات؟ یەكێك لە رابەرەكانی ئەم تازە كردنەوەیە كێیە ؟

و/ لە شێوەی كرمانجی خوارووا سەرەتای تازەكردنەوەی شیعری كوردی و شكاندنی كۆت و یاساكانی كلاسیزم لە بیستەكانی سەدەی بیستەم دەستی پێكرد و یەكێ لە رابەرانی ئەو تازە كردنەوەیە گۆرانی شاعیر بوو.

## گـــۆران

پ٢/ گۆران ناوی تەواوی چییە؟ ساڵی چەند و لە كوێ لە دایك بووە ؟

و/ گۆران ناوی عەبدوڵڵایەو كوڕی سلێمان بەگی كاتبی فارسییە لە ساڵی ١٩٠٤ ز لە شارۆچكەی هەڵەبجە هاتووەتە دونیا.

پ٣/ گۆران بە منداڵی لای كێ خوێندوویەتی ؟ پاشان چووەتە كوێ ؟ بە هۆی چییەوە وازی لە خوێندن هێناوە ؟

و/ بە منداڵی لای باوكی خوێندوویەتی و پاشان چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی و دوو ساڵیش لە قوتابخانەی ناوەندی كەركوك خوێندوویەتی، بە هۆی مردنی باوكی و كوژرانی محەمەد بەگی برای وازی لە خوێندن هێناوەو گەڕاوەتەوە هەڵەبجە.

پ٤/ ئەو كارانەی گۆران كردوویەتی بریتین لە :

١. ماوەیەك مامۆستای سەرەتایی بووە.

٢. لەكاتی جەنگی دووەمی جیهانی بەڕێوەبەری بەشی كوردی بووە لە ئێستگەی (رۆژهەڵاتی نزیك - الشرق الادنی) لە یافا، فەلەستین كە جەنگ برایەوە گەڕایەوە سلێمانی.

٣. دوای شۆرشی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ و دامەزراندنی بەشی زمانی كوردی لە زانكۆی بەغدا بوو بە مامۆستای وانەبێژ ئەدەب و رەخنەی ئەدەبی گوتەوە.

پ٥/ گۆران ساڵی چەند كۆچی دوایی كرد ؟

و/ لە ١٩٦٢/١١/١٨ كۆچی دوایی كرد.

پ٦/ بەرهەمەكانی گۆران بژمێرە ؟

و/ ١. فرمێسك و هونەر ٢. بەهەشت و یادگار ٣. سروشت و دەروون ٤. لاوك و پەیام

٥. هەڵبژاردە (وەرگێرانی كۆمەڵە چیرۆكێكی بیانییە. ٦. جگە لە دەیان وتارو شیعری وەرگێردراوو موحازەرەكانی كۆلێژ.

پ٧/ شیعری ( پایــز ) هی كێیە و كۆپلەیەك لە شیعرەكە بنووسە ؟

و/ هی گۆرانە.

پایــز پایــز

پایز! پایز!
بوكی پرچ زەرد،
من مات، تۆ زیز:
هەردوو هاودەرد!
من فرمێسكم ، تۆ بارانت.
من هەناسەم ، تۆ بای ساردت.
من خەم ، تۆ هەوری گریانت.
دوایی نایە، دادم دادت
هەرگیز ، هەرگیز،
پایز! پایز!



پ٨/ گۆران بۆچی پایزی هەڵبژاردووە ؟

و/ گۆران بۆیە پایزی هەڵبژاردووە لەو وەرزەوە چووەتە باوەشی سروشت چونکە مەرگی جوانی تێدا دەبینی جوانیش لای گۆران هەموو شتێکەو نەمانی جوانی زۆر ئازاری دەدا و دەیخاتە دونیایەکی پڕ ژان و ئازارەوە، نەمانی دارو درەخت ، سیس بوونی گوڵ ، کۆچ و رەوکردنی پۆلی باڵدار.

پ٩ / گۆران لە هۆنراوەی ( پایز ) دا چی بە یەکەوە هاودەرد دەکات ؟

و/ دیاردەی خەم و ئازاری خۆی و سروشت بەرامبەر یەکتر رادەگرێ:

فرمێسك = باران

هـەناسە= بای سارد

خـــەم = هەوری گریان

پ١٠/ هۆنراوەی ( پایز ) ی گۆران لەسەر چ بنەمایەك دامەزراوە باسی بکە ؟

و/ ئەم هۆنراوەیە لەسەر دوو بنەمای دوو لایەنی دامەزراوە. شاعیر و سروشت ( پایز ) شاعیر هاوکێشەیەك دروست دەکات لە نێوان خۆی و پایز هەردووکیان بە یەکەوە هەڵدەچنێ و تێکەڵ بە یەکتر دەبن بە یەکەوەش بەرەو کۆتایی دەچن کە نائومێدیە .

پ١١/ گرینگترین رەگەزەکانی رۆمانتیکی لەم هۆنراوەی ( پایز ) ی گۆران چین ؟

و/ ١. گەڕانەوە بۆ سروشت و تێکەڵبوونی گیانی بە گیانی لەگەڵ دیاردە خەمناکەکانی.

٢. خەم و ئازار خواردن بۆ نەمانی جوانی کە لەم هۆنراوەیەدا لە سیس بوونی گوڵ وەرینی گەڵا و فڕینی باڵدار دەردەکەوێ کە هەموویان نیشانەی مردنن، مردنیش یەکێکە لەو بابەتانەی رۆمانتیك خۆیان پێوە خەریك دەکا .

٣. خەیاڵیکی رۆمانتیکیانەی فراوانی تێدایە بۆتە مایەی دروستکردنی زۆر وێنەی هونەری جوان، وەکو ( بووکی پرچ زەرد و شان و مل رووت ) بۆ پایز و ( رژانی ئاڵتونی دار).

٤. هۆنراوەکە لە سەر کێشی برگەیی ( پەنجەیی - خۆماڵی ) نووسراوەو کێشی ئازادە، چونکە شاعیر پێی چوار برگەیی کردووە بە بنەماو لە هەر ا‌ەتێکدا یەك پێی یان دوو پێی هێناوە، واتە (٤) یان (٨) برگەیە .

٥. لە بارەی سەرواوە گۆران سێ چوارینەی پێشەوەی بە سەروای ( بەنۆرە - متناوب ) کە بەم جۆرە دارژاوە ( أ ب أ ب ) چوارینەی کۆتایش هەموو لەتەکانی لەسەر یەك سەروا دەڕوا ئەمەش پێی دەڵێن چوارینەی تەواو واتە گۆران خۆی بە یەکێتی سەروا نەبەستۆتەوە.

٦. وشەکانی کوردین و خۆی لە وشەی بیانی نەداوە سەراپای هۆنراوەکە رەنگە یەك وشەی تورکی تێدا بێ ئەویش ( ئاڵتون ) ە.

٧. دووبارە کردنەوەی هەندێ وشەی تایبەتی هۆنراوەکە وەکو پایز کە کرۆکی هۆنراوەکەیە بابەتەکەی قوڵتر کردۆتەوە جگە لەو ئاوازە ناسکەی لە دەنگی وشەکانەوە پەیدا دەبێ و هۆنراوەکە پڕ ئیقاعی خەمناك دەکات.

---

ئامادەکردنی م. عومەر ئەحمەد خدر ئامادەیی ئازادیی کوڕان و ئامادەیی زانیاریی ئەهلی



## ڕۆمانتیك لەئەدەبیاتی کوردی شێوەی کرمانجی خوارووداً

١- یەکێ لە ڕابەرانی تازە کردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی بریتییەلە : A- مەحوی B- نالی C- خانی D- گۆران

## گـــــۆران

٢- ( عەبوڵلای کوڕی سلێمان بەگی کاتبی فارسی ) ناوی کێیە ؟ A- مەولەوی B- جگەرخوێن C- گۆران D- شێخ ڕەزا

٣- گۆران ساڵی چەند لەدایك بووە ؟ A- ١٩٠٠ز B- ١٩٠٢ز C- ١٩٠٤ز D- ١٩٠٦ز

٤- گۆران لەکوێ لەدایك بووە ؟ A- هەڵەبجە B- سلێمانی C- کەرکوك D- هەولێر

٥- بە منداڵی لای باوکی خوێندوویەتی و پاشان چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی و دوو ساڵیش لە قوتابخانەی ناوەندی کەرکوك خوێندوویەتی A- جگەرخوێن B- گۆران C- مەولەوی D- شێخ ڕەزا

٦- کام شاعیر ( لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی بەڕێوەبەری بەشی کوردی بووە لە ئیستگەی ( ڕۆژهەڵاتی نزیك - الشرق الادنی ) لە یافا ) A- جگەرخوێن B- گۆران C- عەلی حەریری D- شێخ ڕەزا

٧- کام شاعیر ( ساڵی ١٩٥٨ و دامەزراندنی بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی بەغدا بوو بە مامۆستای وانەبێژ ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی دەگوتەوە ) A- مەولەوی B- کامەران بەدرخان C- گۆران D- شێخ ڕەزا

٨- گۆران ساڵی چەند کۆچی دوایی کردووە ؟ A- ١٩٥٩ز B- ١٩٦٠ز C- ١٩٦١ز D- ١٩٦٢ز

٩- ( فرمێسك و هونەر ) یەکێکە لەبەرهەمەکانی : A- مەولەوی B- جگەرخوێن C- ناری D- گۆران

١٠- یەکێك لەمانە بەهەمی ( گۆران ) ی شاعیرە

A- سروشت و هونەر B- لاوك و حەیران C- سروشت و بەهار D- بەهەشت و یادگار

١١- یەکێك لەمانە بەهەمی ( گۆران ) ی شاعیرە

A- سروشت و هونەر B- لاوك و حەیران C- سروشت و بەهار D- لاوك و پەیام

١٢- یەکێك لەمانە بەهەمی ( گۆران ) ی شاعیرە

A- سروشت و هونەر B- لاوك و حەیران C- سروشت و بەهار D- سروشت و دەروون

١٣- ( هەڵبژاردە ) یەکێکە لەبەرهەمە وەرگێردراوەکانی : A- مەولەوی B- جگەرخوێن C- ناری D- گۆران

١٤- شیعری ( پایـــز ) هی کێیە ؟ A- مەولەوی B- جگەرخوێن C- ناری D- گۆران

١٥- لە شیعری ( پایز ) دا ( من مات تۆ زیز ) لەدوای ئەمە کامیان دێت ؟

A- بوکی پرچ زەرد B- پایز پایز C- هەردوو هاودەرد D- هەرگیز هەرگیز

١٦- لە شیعری ( پایز ) دا ( من خەم تۆ هەوری گریانت ) لەدوای ئەمە کامیان دێت ؟

A- من هەناسەم، تۆ بای ساردت B- دوایی نایە دادم دادت C- من فرمێسکم، تۆ بارانت D- من مات، تۆ زیز

١٧- گۆرانی شاعیر لەکام بەرهەمدا دەگاتە ئەوپەڕی ڕۆمانتیکیەت

A- پایز B- لاوك و پەیام C- هەڵبژاردە D- بەهەشت و یادگار

١٨- گۆران سۆزێکی خەست و قووڵ بەسروشتی دەبەستێتەوە لە خەمناکترین وەرزی ساڵدا کەبریتییەلە

A- بەهار B- هاوین C- پایز D- زستان

